93
یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

بڕیار
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

ساڵی هەشتەم
ئازاری ٢٠١٦

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی





# با خۆمان لە جوانی ئەم بەهارە مەحروم نەکەین!

# خۆت ژمێریاری خۆت بە !

# نیگارکێشی بەخشندە

# دایکی من لەدایکی تۆ دەوڵەمەندترە!

# کۆیلەی پارە!

# وزەی ورە!

# هاودەمی ڕۆح

# زنجیرە کتێبەکانی بڕیار
# ئەو چرایانەی هەمیشە دەدرەوشێنەوە!




## بەم زووانە
## دەبنە میوانی ماڵەکانتان

No: 93

ئازار

2016


**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگەرد فـارس

زاهیـر زانـا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محەممـەد هاشـم

وەهـاب حەسیب

یەحیـا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی هونەریو دیزاین**

جمال دەروێش

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی: شەقامی سالم -

تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ - ٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧

هەولێر: ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazin@gmail.com

Facebook bryarmagazine

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیك/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار




# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

## ساڵی هەشتەم - ژمارە 93 - ئازاری 2016










# کارگێڕیو بازاڕسازی

# با خۆمان لە جوانی ئەم بەهارە مەحروم نەکەین!

خۆ ناکرێت هەمیشە خەمەکانمان بدەین بە کۆڵمانداو شەوانە لەگەڵ خۆماندا، بیانبەینە ژێر پەتۆکانیشمان!

نا، ئازیزم نا، بەم کارە گەورەترین خودکوژی بەرامبەر بە هەموو خۆشیو جوانییەکانی ژیانمان ئەنجام دەدەین.

با رێگە نەدەین، هیچ کەس بتوانێت خەندەکانمان لێ بشارێتەوەو سۆمای چاومان وەها لێڵ بکات، کە نەتوانین ئەو هەموو جوانییە بێسنوورەی سرووشت ببینین!

با هەموو خۆشییەکانمان لەو دوو سێ دڵۆپە سەرابئاسایەدا نەبینین، کە بە پارەوپووڵی دونیا نێو دەبرێ!

تەنها چاوێك هەڵبڕەو نیگایەك بڵندکە؛ دەزانیت خوداوەند چەند نیعمەتی زۆری بێشوماری، بێبەرامبەر پێ بەخشیویت!

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕەدا لە ژوورەکەت وەرە دەرێو سەیرێکی ئاسمانی شینو هەوری پاكو بێگەردی بەهار بکەو ببینە چۆن پەروەردگار شاخوداخو دۆڵو دەشتی بە فەرشی گوڵو سەوزەگیا ڕازاندۆتەوە بۆت.

سەوزەگیاکە هێندە نەرمە، پێڵاوت هەر ناوێت!

تیشکی خۆر هێندە هێمنە، ئاوو هەوا هێندە خۆشە، پەستەكو فەرەنجیت پێ ناوێ!

بەهار گوڵبارانت دەکاتو بە بۆنی نێرگزو گوڵاڵەو وەنەوشەو گوڵەباخ مەستت دەکات.

بێڵەڤانێك هەڵگرەو تا بەهار دەگوزەرێ، بە کنگرو کاردۆو ئاڵەکۆکو پیشۆکو تۆڵەکەو دومەڵان، تەندرووستیت نۆژەن بکەرەوە!

تۆ زۆر دەوڵەمەندیت، بەڵام هەستی پێ ناکەیت! وا دەزانی گەنجینەکەت، تەنها گیرفانە چکۆلەکەتە!

تۆی مرۆڤ، خاوەنی هەموو ئەم زەوییەیت!! بۆچی سەعادەتو خۆشیی خۆت، داوەتە دەست کەسێکی وەك خۆت!؟

ئەگەر پێشتر ڕێگات دابوو، کە کەسێکی دی، سنوور بۆ پووڵەکانت دابنێ، ئەمڕۆ هەرگیز ڕێگا مەدە، لە جوانیو ئەفسوونی ئەم بەهارە مەحرووومت بکات!

دڵنیابە مرۆڤ گەر کارامەو بەهرەمەند بێت، کامەرانی زۆری تێ ناچێت، دڵ پێویستی بە پارووی چەور نییە، خۆ دڵ نان ناخوات، دڵ هەستی پاكو خۆشەویستیو ئارامیو ڕێزو میهرەبانیی دەوێت!

با ئەم بەهارەت لە هەموو بەهارەکان خۆشتر بێت، بەهرەکانی خودا ئەوەندە زۆرن، کەس ناتوانێت هەموویان زەوت بکات!

لە منداڵیمەوە دەمبیست، گەورەکان ئاوا لە خودا دەپاڕانەوە: خودایە نیعمەتەکانی خۆتمان لێ نەشاریتەوە!

دڵنیام ئەگەر چاوەڕێی دەستی خوداوەند بکەین؛ ئەوا هەرگیز نیعمەتەکانیمان لێ ناشارێتەوە.

من ناهێڵم کەس بەهارم لێ بدزێ، من ناهێڵم خەمەکانم لە جوانی بەهار مەحرومم بکەن، تۆش هەر وا بە!

باوەڕیشم وایە، وەکو ئیمامی شافیعی دەفەرموێ:

إِذَا مَا كُنْتَ ذَا قَلْبٍ قَنُوعٍ     فَأَنْتَ وَمَالِكُ الدُّنْيَا سَوَاءُ

# کارگێڕی بە گوفتار

1
هیواو ئاوات بەبێ کارکردن، جگە لە خەوبینین شتێکی دیکە نییە، کارکردنیش بەبێ هیواو ئاوات، تەنها بەفیڕۆدانی کاتە، بەڵام هیواو ئاوات لەگەڵ کارکردن، ئەو دوو شتەن، کە دەتوانن جیهان بگۆڕن.
جۆیل پارکەر

2
فەلسەفەیەکی سادەی ژیان: کاسە بەتاڵەکان پڕ بکە، پڕەکانیش بەتاڵ بکە، پاشان لەو جێگایەنەدا دایان بنێ، کە هەست دەکەیت، پێویستە لەوێدا دابنرێن.
الیس ڕووزفێلت لونجورپ

3
پلەکانی پەیژە، ئەو ئامانجە نییە، کە مرۆڤ لەسەری ڕابوەستێتو بمێنێتەوە، بەڵکو بۆئەوەیە؛ قاچەکانت خۆی بگرێتو لە کاتی پێویستدا، بتوانیت بە قاچەکەی دیکەت، بچیتە سەر پلەیەکی سەرتر!
تۆماس هاکسلی

4
بەڕێوەبەری نوێ، پێویستە یەکەم کاری بریتی بێت لە کۆبوونەوەیەکی بەپەلە، لەگەڵ کارمەندەکانیدا؛ تا نیگەرانیو دڵەڕاوکێی نێوانیان، کەم بکاتەوەو نەیهێڵێت.
جۆرج فولر

5
هیچ دامەزراوەیەك پێش ناکەوێتو گەشە ناکات، ئەگەر سەرەتا کارمەندەکانی بەرەو پێش نەباتو گەشەیان پێ نەدات!
تاریق سویدان



# کۆیلەی پارە!

دەگێڕنەوە: لە دێر زەماندا کابرایەکی داربڕ لە گوندێکدا دەژیا، بەڵام بە ڕژدیو چرووکی ناسـراو بوو، ڕۆژ تا ئێوارە، خەریکـی داربڕین بوو، هەموو ئەو پارانەشـی کە دەسـتی دەکەوتـن، کۆی دەکردنەوەو دڵی نەدەهات خەرجیان بکاتو بەردەوام پاسەوانی دەکردن.

ڕۆژێکیان کاتێك بە ڕێگادا دەڕۆیشت بۆدار بڕین، پڵنگێك هێرشی بۆ هێناو پڕی پێدا کردو قەپی کرد بە جلەکانیداو فڕاندی.

کوڕەکـەی زۆر دوور نەبوو، چاوی بـەم کارە کەوت، بۆ ڕزگارکردنـی باوکی، بەپەلە ڕای کرد و تەورەکەی هەڵگرت، لەبەرئەوەی پڵنگەکە باری قورس بوو، هەر زوو توانی بگاتە سـەری، باوکیشی زۆر ئازاری نەبووبوو؛ چونکە پڵنگەکە بە جلەکانی هەڵیگرتبوو!

کاتێـك باوکی بینـی، وا کوڕەکـەی نزیـك بووەتەوەو دەیەوێت پڵنگەکە بداتە بەر تەور، هاواری کرد:

کوڕەکـەم ئاگاداربە، چەرمی پڵنگەکـە بریندار نەکەی، ئەگـەر دەتوانـی بەبێئـەوەی چەرمەکـەی کـون بکەیت، بیکوژیت؛ ئەوا زۆر باش دەکەیت؛ چونکە چەرمەکەی پارەی باشمان بۆ دەکات، بیکوژە، بەڵام برینداری مەکە!!

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١- خۆشی ژیان، ئەوەیە کە سوود لە بەهرەو خەڵاتەکانی پەروەردگار وەربگریـت، نەك ببیت بە کۆیلەی پارەوپووڵو سەروەتی دونیا.

٢- نابێـت خۆشەویسـتیو خولیـای پارەکۆکردنـەوەو زۆرکردنـی، وامان لێ بکات، کە ئاگامان لە ڕۆحی خۆشـمان نەمێنێتو خودی خۆشمان بیر بچێتەوە.

٣- ئـەو کاتـەی مـرۆڤ دەبێت بـە کۆیلەی پـارە، لە مرۆڤایەتی دەشۆرێتو هەستو نەستی دەمرێتو هەست بە ئازاری کەس ناکاتو چاوی کەس نابینێت.

٤- مرۆڤـە مـاددیو پارەپەرسـتەکان، ئەگەر لـە قوڕگی شێریشـدا گیریـان خواردبێت؛ لەتـاو پارەکانیـان ئاگایان لە خۆیان نەماوە، جا دەبێت چۆن ئاگایان لە کەسانی دی مابێت.

٥- هەرگیز باوەڕ بە خۆشەویستیو دۆستایەتیی مرۆڤی مـاددیو پارەپەرسـت مەکە؛ چونکـە ئەو جگە لـە پارە، دۆستێکی دی نییە!

٦- بـە ڕووکـەش فریـو مەخـۆ، ژیانـی ئـەم جـۆرە دەوڵەمەندانـە، جگـە لـە دەردەسـەریو خـەمو خەفەتو دۆزەخێکی گەڕۆك، چیدی نییە!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

01

یەکەم بەرپرسیارێتیی سەرکردە، دیاریکردنی ڕاستییەکانە، کۆتا بەرپرسیارێتیشی، سوپاسکردنی کەسانی دیکەیە، ئیدی ئەوەی لەو نێوەندەدا دەمێنێتەوە، ئەوەیە کە سەرکردە، خۆی بە خزمەتکاری نیشتمانەکەی بزانێت!

**ماکس دیبری**

02

سەرکردە ئەو کەسەیە، شارەزای ڕێگایە، لەو ڕێگەیشدا دەمێنێتەوە، بۆ شوێنکەوتوانیشی ڕوون دەکاتەوە، چی لە ڕێگادا هەیە!

**ماکس دیبری**

03

ترسناکترین ئەفسانەی کۆن کە قسە لەسەر سەرکردە دەکات، ئەوەیە کە پێی وایە: سەرکردە لەدایک دەبێت، واتە: سەرکردایەتیکردن بۆماوەییەو بە میرات بۆت دەمێنێتەوە، لە ڕاستیدا ئەم قسەیە، نەک هەر مانای نییە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە، سەرکردە خۆی خۆی درووست دەکات، واتە: سەرکردایەتی بەدەست دەهێنرێت، نەک لە ڕێگەی بۆ ماوەوە وەری بگرێت!

**وارن بینیس**

04

ئەو کەسەی نازانێت، چۆن ئەرکو فەرمانەکان جێبەجێ بکات، ناگونجێت ببێتە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو!

**ئەرستۆ**

05

شانازیکردن بە ڕابوردووەوە، واتە: تۆ، هیچ بەرنامەیەکت بۆ ئاینده نییە؛ چونکە هەموو یاساکانی یاریکردن، گۆڕاون!

**جویل بارکر**



# چۆن دەبیت بە سەرکردە؟

## بەشی یەکەم

چاو لە کۆمەڵێك مێروولە بکە، کە لە نزیکتەوە پۆل پۆل ڕێ دەکەن، یەکەمجار بەڕێوەبەرێك، یان سەرکردەیەك، بۆ ئەو کۆمەڵە بەرچاو ناکەوێت؛ تا چیی شایستەو پێویستە، لەسەر لەشکری مێرووله‌کان، پێیان ڕابگەیەنێت.

بێگومان کارو فەرمانی مێروولە، بە بەرنامەیەو لە مێشکی هەریەکەیاندا هەڵگیراوە.. هەموو مێروولەیەکیش بە سرووشتو خوداکردی خۆی، کاری خۆی بەئەنجام دەگەیەنێت.

بەڵام خۆ ئێمە، مرۆڤینو مێروولە نین، ئێمە بەدیهێنراوو خوڵقێنراوێکی ئاڵۆزین، هەر یەکێمان خاوەنی بیرکردنەوەی خۆیەتیو لە هەمبانەی خۆی، گوێز دەژمێرێت.. لەبەر ئەمەیە، پێویستمان بە سەرکردەیەك هەیە؛ تا لە بەدیهێنانی ئامانجەکانماندا، یارمەتیمان بدات.

چەند کەسێك لە چاڵێکی قووڵدا دابنێ، ئەرکێکیشیان بخەرە سەر شان، بۆ نموونە: داوایان لێ بکە، تەنها لە چاڵە قووڵەکە بێنە دەرو هیچی دی.. دواتر تێك دەچرژێنو دەیکەن بە جەنجاڵی، هەریەکەیان دەبێت بە بەردی سەر ڕێی ئەوی دیکەیان، تا ئەو دەمەی سەرکردەیەك لە ناویاندا سەر هەڵدەدات، پاشان دەڵێت: فلان کەس، ئەژنۆت بخەرە سەر زەوی.. تۆ، فیسار کەس، بەسەریدا پشت بچەمێنەرەوە.. بەڵێ، بەم شێوەیە.. تۆش، بەسەریاندا هەڵبگەڕێو دەربچۆ. ئیدی بەم چەشنە، هەموویان دەبینی، بەخێرایی لە چاڵەکە هاتوونەتە دەرەوە.

یاخود کۆمەڵێك منداڵ، لە دەوری خۆت خڕ بکەرەوەو تۆپێك هەڵبدەو بڵێ: دەی یاریی پێ بکەن.

سەرەتا دەبینی، هەمووان ورووژم بۆ تۆپەکە دەبەنو پاڵەپەستۆیانە، بێسەروبەر هەر منداڵەو شەقێ شووت لە تۆپەکە هەڵدەدا، تا ئەو کاتەی منداڵێك لەناویاندا، تۆپەکە دەگرێتو دەڵێت: با ببین بە دوو دەستەوە.. هەیاهەیا دەکەنو دەبن بە دوو تیپ. منداڵەکانیش بە خواستی دڵیان دەگەنو بەخۆشی یاری دەکەن.

لێرەدا ئەو کەسە، یان ئەو منداڵە، دەوری بەڕێوەبەر، یان سەرکردە دەبینێت.

### بەڕێوەبەرەکان سەرکردایەتی دەکەن

ڕەچەتەو نووسراوێکی ئەفسووناویمان بۆ سەرکردایەتی نییە؛ چونکە سەرکردایەتی، هونەرە، پیشەیە، لێهاتوویی‌و بەهرەیە.. برێك کەس لە زگماکەوە، ئاکاری سەرکردایەتییان تێدایە.. برێکی دیکەش، فێری سەرکردایەتی دەبن. کۆمەڵە کەسێکیش هەن، ناتوانن جڵەوەکەی بگرن، دەستەیەکی دیکەش هەن، نەك ناتوانن ببن بە سەرکردە، بەڵکو هەر بیرێکیشی لێ ناکەنەوە.

جا ئەگەر تۆ، لە دواهەمین جۆری؛ ئەوا گۆشەی سەلیقەی کارگێڕی مەخوێنەرەوە.

### هەر سەرکردەیەك بگری، بێهاوتاو تاقانەیە

لە ئاکامدا، دەبێت هەموو سەرکردەیەك، شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەبێت؛ چونکە سەرکردەیەك دەبینین، چوستو توندو پڕجۆشوخرۆشە، لە کاتێکدا سەرکردەیەکی دیکەمان بەرچاو دەکەوێت.. لەسەرخۆ، هێواشو نەرمونیانە. سەرباری ئەوەش، هەردووکیان لە هەمان ئاستی لێهاتووییدان.

تۆش تەنها پشتیوانی کارمەندەکانت بەدەست بهێنەو دەسکەوتەکانیش بە چوستو چالاکییەوە بەدی بهێنە.

بەڵام وێڕای جیاوازیی شێوازو ڕێگاکان، چەند ڕەوشتو تایبەتمەندییەك هەیە، سەرکردە چاکەکانی پێ جیا دەکرێتەوە، دەتوانیت برێك لەم ئاکارو تایبەتمەندییانە، لە هەندێك سەرکردەدا بدۆزیتەوەو پەیدای بکەیت. وەك: عومەری کوڕی خەتتاب، سەلاحەدینی ئەییوبی، مەهاتما گاندی، چەرچڵ، جۆن کەنەدی.

لێرەدا، وات دێتە بەر چاو، تۆ ئامادەسازیی تەواوت نییە؛ تا هاوشێوەی ئەوانە بیت، بەڵام بۆئەوەی ببیت بە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو، گەر تۆزێك ئومێدت ناوەتە سەر یەکو هەندێك هیوات پاشەکەوت کردووە؛ ئەوا گوڕ بدەرە بەر خۆت؛ چونکە ئەرکی سەرشانت، هەوڵدانەو هیچی دی. بەکوردییەکەی: بەرەکەت، وا لە حەرەکەتدا.

**لە بەشی ئایندەدا، چاوەڕێی «چەند ڕەوشتو ئاکاری سەرکردە»بە.**



# کاری کەم‌و ئەنجامی مەزن

## ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە

ن: عبدالله العثمان و: جەلال عەبدوڵلا

### ٢٦- ڕۆژی لاپەڕەیەك بنووسە..

نووسینەوە بکە بە نەریتێکی ڕۆژانە، پەیمان بدە بە خۆت، ڕۆژانە لاپەڕەیەك بنووسیتەوە، یادەوەرییەکانت، بیرو بۆچوونەکانت، ئارەزووەکانت، دەستکەوتەکانت، چی فێربویت، بیری داهێنەرانە، هەستو سۆزت، ڕۆژەکەت چۆن بوو، هۆنراوەکانت، یادگاری‌و وتارەکانت بنووسەرەوە؛ بۆئەوەی پاشەکەوتێکی ڕۆژانەت هەبێت لە نووسین، بۆئەوەی تێبینی پێشکەوتنەکانت بکەیت‌و ئێستا لە کوێدایت بەرەو کوێ دەچیت؟ کەی دەگەیتە جێ؟ پرسیارو تێڕامانەکانت بنووسە، نامەی پڕ هەستو خۆشەویستی بنووسە بۆ ئەوکەسانەی خۆشت دەوێن، سوپاسی ئەو کەسانە بکە، یارمەتیدەرت بوون، نامە بنووسە بۆ خودی خۆت، خۆشەویستی‌و ڕێزی خۆتی بۆ دەرببڕە.

### ٢٧- ڕێکخستن‌و کەمکردنەوە.

لەو کارە گرنگانەی دەتوانین لە ڕێگەیانەوە، کاتمان دەست بکەوێت، ڕێکخستن‌و کەمکردنەوەیە، لە سەرەتادا کاتی پێویستەو لەسەر دەروونمان کەمێك قورسە، بەڵام دواتر زۆر جوانەو هەست بە ئەنجامەکەی دەکەیت، باشترین ڕێگا بۆ کەمکردنەوەی کاغەزەکان، پرسیارکردنە لە خودی خۆت، ئایا پاش پێنج ساڵی تر، پێویستیت بەم کاغەزە هەیە؟ ئەگەر وەڵامەکەت «بەڵێ»یە؛ ئەوا دەتوانیت هەڵی بگریت، ئەگەرنا ئەوە فڕێی بدە، هەروەها کەمکردنەوەی جل‌وبەرگ، ئەگەر جل‌وبەرگی زیادت هەبوو؛ دەتوانیت کەمی بکەیتەوە، هەڵبەت بەفڕێدانی نا، بەڵکو بە بەخشینی بەو کەسە هەژارانەی پێویستیان پێیەتی، دواتر هەست بەئارامی‌و دڵخۆشی دەکەیت.

### ٢٨- نوێژو خوداپەرستی.

خوداپەرستی، ڕۆحمان دەمەزرد دەکاتەوە، وزەکان بارگاوی دەکاتەوەو هاوسەنگی دەگێڕێتەوە بۆ لەش، لە ڕۆحمان‌و لە ئارەزووە ڕاستەقینەکانمان نزیکمان دەکاتەوە، یارمەتیمان دەدات بۆ تێپەڕبوون بەم ژیانەدا. پێویستە لەسەر کانیاوە ئیمانییەکان، هەڵوێستە بکەین، ئاوی زیندوێتی تێدا بخۆینەوەو خۆراکی پێویست بخۆین، بۆ بەردەوامبوون لە گەشتەکەمان، بنیادەم کاتێك نوێژ بەجێ دەهێنێت، هەستی ئارامی‌و بەرەکەت دای دەگرێت، ئارەزووی زیاتر دەکات، خۆشەویستی بۆ دەستکەوتی گەورەترو سینەسافی‌و ئارامیی دەروونی ڕووی تێ دەکات، ئاگاداری وێستگەکانی گوێڕایەڵیی فەرمانی خودا بە، خێرێکی دیاریکراوە لەسەر ڕێگەی گەشتەکەمان.

### ٢٩- پەیوەندیی خزمایەتی.

لەو فەرمانانەی ئاینی ئیسلام ئاماژەی بۆ کردووەو بەگرنگ وەسفی کردووە، بانگەشەی بۆ دەکات، پەیوەندیی خزمایەتییە، گرێ دراوە بە عەرشی خوداوە، هەر کەسێك بیگەیەنێت، خودا دەیگەیەنێت، (من وصلها وصله الله)، پەیوەندیی خزمایەتی، سوودی زۆری هەیە، بەرەکەت دەخاتە کاتەوە، هیمەت زیاد دەکات، تەمەن درێژ دەکاتەوە، خۆشەویستی‌و هێزو خۆشی‌و شادی دەهێنێت، کەسوکارت باشترین کەسانێکن، هاوبەشیان بکەیت لە سەرکەوتنەکانتدا، ئەوانن لەگەڵتدا دەوەستن، تۆ بە ئەوانەوە هەیت‌و ئەوانیش بە تۆوە، سیلەی ڕەحم سوودی زۆری هەیە، بەڵام لەو کارانەیە، کە ئەنجامی گەورەی هەیە لەسەر تۆو ئەوانی تریش.

### ٣٠- دووکار لەیەك کاتـــدا.

خەڵکی دوو کۆمەڵن: کۆمەڵەی یەکەم حەزیان لە تەرکیزکردنە لەسەر یەك کار، تا تەواوی دەکەن، کۆمەڵەکەی تر، حەزیان لە ئەنجامدانی زیاتر لە یەك کارە لە یەك کاتدا، خوێندنەوەی زیاتر لە کتێبێك‌و بەم شێوەیە، ڕێگەی خۆت بدۆزەرەوە بیگرە بەر، ئەوانەی لە کۆمەڵەی دووەمن، بیانەوێت تەرکیز لەسەر یەك کار بکەن؛ ئەوا خۆیان لەناو دەبەن‌و هەست بە بێزاری دەکەن، هەردوو حاڵەتەکە ئاساییە، دەتوانیت تەرکیز لەسەر کارێك بکەیت، یان دوو کار لەیەك کاتدا، یان دوو پڕۆژە لەهەمان کاتدا، هەردوو حاڵەتەکە سەرکەوتووە بەگوێرەی کەسێتیی مرۆڤەکە.



سامان کەریم
بەشی حەوتەم

# کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

گرنگیی ئەم سێ بەشە لەم دوو خاڵەدا شی دەکەینەوە:

یەکەم: بەم ســێ بەشــە، فۆڕمێکی وێنەدار درووست دەکەین بۆ هەر تاکێك، لەگەڵ هەموو زانیارییەکانی پێشــوو کە باســمان کردن، دەبن بە ناســنامەی گشــتیی هەر تاکێك بۆ هەر فەرمانگەیەك، کە پێویست بەو بەڵگەنامانە بکات، گرفتی هەموو هاوڵاتییەك چارەسەر دەکات بۆ هەموو شــوێنێك، لەبەرئەوەی هاوڵاتی ڕزگاری دەبێت لەو شــێوازە تەقلیدیە، کە هەریەکێك لەم ســێ بەڵگەنامانەمان پێویست بێت بۆ هەر فەرمانگەیەك دەبێت کۆپی هەرسێکیانت پێ بێت، بۆیە بەم ڕێگایە بنەبڕی ئەم حاڵەتە دەکەین.

دووەم: لەڕێی ئەم ســێ بەشەوە، نیوەی ئامارەکانمان بە ڕاستو درووســتی جێبەجێ دەکەیــن، ئەمەش خاڵێکی گرنگــە، لە ڕێیەوە هەندێك کێشەی پێ چارەسەر بکەین.

دەگەڕێینەوە ســەر خشــتەی سەرەکیو چەند بەشــێکی تر، بۆ خشتەکەمان زیاد دەکەین:

| | دیـــــن | نەتەوە | ئاستی ژیان |
|---|---|---|---|
| + | | | |

دین: ئەم بەشــە گرنگــە؛ بۆئەوەی ڕێژەی هەمــوو ئەدیانەکان بزانین بەپێی ژمارەی دانیشتووان، بشزانین چۆن بەسەر ناوچەکاندا دابەش بوون.

نەتەوە: گرنگیی ئەم بەشــە، بۆئەوەیە کــە ڕێژەی نەتەوەکانی تــر بزانین بەپێی ژمارەی دانیشــتووان، بزانین بەســەر ناوچەکاندا چــۆن دابەش بوون، ئەم بەشــە تەنها ئەو کەســانە دەگرێتەوە، کە لەدێــر زەمانەوە لێرە نیشــتەجێن، نەك ئەوانەی کە بەهۆی خراپی باری ئەمنی، یان هۆکارێکی ترەوە، لێرە نیشتەجێن، دەشبێت هەموو مافێکیان وەك کورد هەبێت، وەك: (تورکمان، یەزیدی، کلدو ئاشوریو ئەوانی تریش).

ئاســتی ژیان: مەبەســتمان لەم بەشــە (دەوڵەمەندیو ناوەندو هەژارییە)، واتە: چینایەتی کە ئێســتا چینایەتی بووە بەکێشەیەکی زۆر باوی کۆمەڵگا بەشــێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، کە دەبێت کار بکەین بــۆ بنبڕکردنــی ئــەم دەردە؟ چــۆن؟ بەپێی خاڵبەندییــەك کە لە جێبەجێکردنی ئەم پلانەدا، پەیڕەوی دەکەینو ڕێژەی چینەکانی پێ دیاری دەکەینو کار بۆ نەهێشتنی چینە پەراوێزخراوەکان دەکەین.

**پۆلێنکردنی ئاستی ژیان:**

دەتوانیــن ئاســتی ژیان، بکەیــن بە پێنج بەشــەوە، یان زیاتر؛ لەبەرئەوەی لە ئێســتادا، چینەکان زۆرترن لە پێنج، بەڵام بۆئەوەی ئاڵۆزتر نەبێت لەمە، بۆیە ئاســتی ژیانمان دابەش کردووە بۆ پێنج چین. واتە: دەتوانین بەپێی ئەو پێداویســتییانەی کە هەر خێزانێك هەیەتــی، چینەکانی کۆمەڵگا بەشــێوەیەکی زانســتی دیاری بکەین، بەپێــی هەر ناوچەیەکی نیشــتەجێبوون کار بکەین بۆ نەهێشــتنی چینــە کەمداهاتــەکان؛ چونکە تاکو بەم پۆلێنــە خێزانەکان دیاری نەکەین، ئاســتی چینایەتیمان بۆ دیاری ناکرێت.وەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێت.

| ژمارە | پلەبەندی | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | دەوڵەمەند | کەسی بێکێشەو بێناگا لە برسی. |
| ٢ | ناوەڕاستی باڵا | بــەو خێزانە دەوترێــت کە زیاتر، یــان دوهێندە بەرەو ژووری ناوەڕاستی هەبێت. |
| ٣ | ناوەڕاست | بــەو خێزانە دەوترێت، کە خانووی خۆی هەبێت، ئوتومبێلی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئەو بڕە بودجەیەی کــە بەدەســتی دەهێنێت، بەشــی پێداویســتی خێزانی بکاتو توانای پاشەکەوتیشی هەبێت. |
| ٤ | هەژاری پلە دوو | بــەو خێزانە دەوترێــت، کە کرێچــی بێت، بەڵام ناتوانێــت هیچ پاشــەکەوتێك بکات، هەر بەشــی کرێو مەسرەفی خێزانی خۆی دەکات. |
| ٥ | هەژاری پلە یەك | بە کەســێك دەوترێت، کــە کرێچی بێتو ئەو بڕە بودجەیەی کە بەدەســتی دەهێنێت، بۆشاییەکانی ژیانی پڕ نەکاتەوەو ئەندامانی خێزانی زۆر بێتو زۆر کاتیش قەرزارە. |

**ڕوونکردنەوەی گرنگ لەسەر ئاستی ژیان:**

یەکەم: لەڕێی ئەم بەشــەوە ڕێژەی هەمــوو چینەکانی کۆمەڵگا بەپێی ژمارەی دانیشتووانو شوێنی نیشتەجێبوون دەزانین.

دووەم: کــە ڕێــژەی چینەکانی کۆمەڵگامان زانی، بەشــێوەیەکی زانســتی بەپێی ژمارەی دانیشتووانو ناوچەکانی نیشتەجێبوون؛ ئەو کات لەڕێــی پلانی ئاوەدانکردنەوەوە، کار بۆ نەهێشــتنی چینەکانی خــوارەوە دەکەیــن؛ لەبەرکرێچێتییانو لەپلانــی ئابووریدا، گرنگی بــەم چینانە دەدەین، کە ئەو کاتە ئــەوەش ڕوون دەکەینەوە، چۆن داهاتیان زیاد بکەین.

ســێیەم: ئاستەکانی ژیان، بەشــێوەیەکی فەرمی دەکرێن بە سێ بەشــەوە (دەوڵەمەند، ناوەند، هەژار) بەڵام لە ئێســتادا، چینەکانی کۆمەڵــگا زۆر بــوون، کــە دەبێــت لەڕێــی ئــەم پلانــەوە، کار بۆ نزیکبوونەوەی چینەکان بکرێت لەیەکتر، لەبەرئەوەی خەریکە وای لێ بێت چینایەتیی زۆر، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی نەهێڵێت.

چــوارەم: لەئێســتادا ئــەم پێنج پلەیــە، زۆر دەبینرێــت لەناو کۆمەڵــگادا، ئەگەرنا چینەکان لە پێنج زیاترن، هەربەشــێکیش لەو چینانــە، دەبن بە چەند بەشــێکی ترەوە، گەر بشــمانەوێت هەموو

چینەکان بەزانستی بزانین؛ دەبێت زیاتر لە پێنج چین بنووسین. بۆ نموونە: (حەوت، یان نۆ)؛ بۆئەوەی کارەکەمان زانستی دەربچێت، گەر پێویستیشی کرد؛ ژمارەی چینەکان لە پێنج زیاتر دەکەین.

دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو چەند بەشێکی تر، بۆ خشتەکەمان زیاد دەکەین:

| | ڕەگەز | باری خێزانی | سەرۆک خێزان زیندووە | زیندوو یان مردوو |
|---|---|---|---|---|
| + | | | | |

**ڕەگەز:** ئەم بەشە، بۆ زانینی ڕێژەی نێرو مێیە، بەپێی ژمارەی دانیشتووانی هەر ناوچەیەکو بۆ چەند حاڵەتێك، سوود لە زانینی ئەم ئامارە وەردەگرین، لەوانە دامەزراندنو هەلی کار، کە هەندێك هەلی کار هەیە، لەگەڵ ڕەگەزی نێردا گونجاوترەو هەندێك کار لەگەڵ ڕەگەزی مێدا، دەشبێت بۆ دامەزراندنو زۆر شتی تریش، کار لەسەر بنەمای ڕەگەز بکرێت.

**باری خێزانی:** ئەم بەشە، بۆئەوەیە کاری جددی لە داهاتوودا بۆ ئەو کەسانە بکەین، کە تەمەنیان چۆتە تەمەنی ژیانی هاوسەریو هێشتا هاوسەریان نییە، کە زۆرینەی خۆی لە نەبوونی شوێنی نیشتەجێبووندا دەبینێتەوە، کە دوای چارەسەرکردنی کێشەی کرێچێتی، دەبێت یەکەی نیشتەجێبوون بۆ ئەو گەنجانە بکرێت، کە تەمەنی هاوسەرگیرییان تێپەڕاندووەو خێزان دروست ناکەن، نەك هەر ئەم هۆکارە، بگرە چەندان هۆکاری تریش چارەسەر بکرێت، لەگەڵ ئەمەشدا چەندین ڕێژەی تر بۆ دانیشتووان دیاری دەکەین. ئەمەی سەرەوە کە وتمان، سەڵت بوو لەوانە (سەڵت، خێزاندار، بێوەژن، بێوەپیاو (ئەوەی کە ژنی هەبووەو نەیماوە، یان لێی جیابۆتەوەو ئێستا بێژنە)، دەزگیراندار)؛ بۆئەوەی ڕێژەی ئەم بارە خێزانییانە بەشێوەیەکی زانستی بزانین.

**سەرۆك خێزان زیندوە:** وەڵامی ئەم بەشە، بە بەڵێو نەخێر دەبێت؛ بۆئەوەی بزانین چەند خێزانی بێباوکو بێسەرپەرشت هەیە؛ تاکو حکومەت خۆی ببێت بە سەرپەرشتیکاری ڕاستەوخۆی ئەو خێزانانەو هەموو پێداویستییەکیان دابین بکات؛ بۆئەوەی سازش بۆ هیچ کەس نەکەن؛ تاکو لێکەوتەی خراپی کۆمەڵایەتی لێ نەکەوێتەوە، گرنگیی ئەم ڕێگایەش، ئەوەیە کە نهێنیی هەموو خێزانێکیش پارێزراو دەبێت.

**زیندوو، یان مردوو:** ئەم بەشە، بۆ هەموو تاکێکە، بۆئەوەیە کاتێك هەر تاکێکی کۆمەڵگا دەمرێت، لە ژمارەی دانیشتووانی گشتی دەربکرێت، کە ئەم کردارەش بە شێوازێکی ئۆتۆماتیکی ئەنجام دەدرێت، بەشێوەی کاتێك دەنووسیت (مردوو)، ڕاستەوخۆ لە ژمارەی خێزانو دانیشتووان دەردەکرێتو دەچێتە خشتەی مردووانەوە، کە لەو خشتەیەدا، بەرواری مردنو جۆری مردنو هۆکاری مردن، بەخشتەیەکی جیاواز دیاری دەکرێت، لەڕێگەی زانیارییەکانی پزیشکی دادوەرییەوە؛ بۆئەوەی ساڵانە ڕێژەی مردنو شێوازەکانی دیاری بکەینو چارەسەر بۆ هەر یەك لەو شێوازی مردنانە بکەین.

**گرنگیی خاڵی زیندوو مردوو:**

**یەکەم:** هەرکات هاوڵاتییەك دەمرێت، لە سەرژمێریی گشتیی دانیشتووان دەردەهێنرێت؛ چونکە ئەم حاڵەتە، ئێستا بوونی هەیە، کە مردوو لە سەرژمێریی دانیشتووان دەرناهێنرێت، ئەوەی جێی داخە ناشتوانن چارەسەری بکەن، کە بەم پلانە، زۆر ئاسان چارەسەر دەکرێت.

**دووەم:** لەم ڕێگایەوە بەپێی کرداری پاڵاوتن (فیلتەرەیشن) ڕێژەی مردنی ساڵ، یان وەرز، یان مانگ، یان هەر کاتێك کە بمانەوێت دیاری دەکەین، بەشێوەیەك کە بەرواری مردنو جۆری مردنو هۆکاری مردن، بەپێی شوێنەکانی نیشتەجێبوون دەزانینو دەتوانین کار بۆ چارەسەرکردنی هۆکارەکانی مردن بکەین، هەرچی بێت بۆئەوەی ئەو دیاردانەی مردن نەهێڵین، یان کەم بکەینەوە.

**سێیەم:** خاڵێکی گرنگ ئەوەیە، کە ئێستا بینیومانە هاوڵاتیی مردوو، ناوی دێتەوە بۆ دەنگدانو ناوی لەکۆبوونی خۆراکدا هەیە، کە بەڕاستی دەتوانین، بەم پلانە ئەم کێشانەو زۆر کێشەی تریش چارەسەر بکەین.

دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو بەم دوو بەشە، کۆتایی بە خشتەکەمان دەهێنین:

| | ژمارەی مۆبایل | جگەرەکێش |
|---|---|---|
| + | | |

**ژمارەی مۆبایل:** ئەم بەشە بۆ پەیوەندیکردنە بە هەر هاوڵاتییەکەوە لە کاتی بوونی هەڵەیەك لە زانیاریدا، یان هەر بەشێك کە پەیوەندیی بەم بەشەوە هەبێت، وەك دۆزینەوەی هەلی کارو دامەزراندن چەندین بواری تر.

**جگەرەکێش:** ئێستا کۆمەڵگا بەدەست ئەم دەردەو چەندین دەردی ترەوە دەناڵێنێت، کە هەر یەکێکیان پەیوەستە بە هۆکارێکەوە، بۆیە پێویستە، ئەم ڕێژەیە بزانینو کار بۆ نەهێشتنی هۆکارەکانی بکەین، واتە: دەبێت لەڕێی ئەم پلانەوە، هۆکارەکان بزانینو چارەسەری بکەین، کە چەندین ڕێگا هەیە بۆ چارەسەر، گەر کەسێك خۆی مەبەستی بێت.

## چەند تێبینییەکی گرنگ، لەسەر تەواوی بەشەکان

**یەکەم:** هەموو ئەم بەشانەی کە ئاماژەمان بە هەر دانەیەکی کردو شیکردنەوەمان بۆ کرد، بریتی بوون لە فۆڕمی خێزانی، کە دەتوانین بڵێین (بانکی زانیاری)، کە پێویستە، هەموو زانیارییەکانی ڕاستو دروست بن؛ بۆئەوەی ئامارێکی ڕاستو دروستمان هەبێت؛ چونکە گەر ڕاست نەبن؛ ئامار لەسەر بناغەی درۆ دروست ناکرێت. گەر زانیاریی هەر خێزانێکیش هەڵە بوو؛ خۆی زەرەرمەند دەبێت.

**دووەم** هەندێك بەش هەن، کە شیکردنەوەمان بۆ کردن، ڕەنگە هاوڵاتی بپرسێت، گرنگییەکەی لەچیدایە، گرنگی لەوەدایە، کە بۆ پلانەکانی ترو لە شوێنو جێگەی تردا، سوودیان لێوەردەگرین؛ چونکە ئەم پلانە گشتییەو زۆرینەی پلانەکانی تر، پەیوەندییان بەم پلانەوە هەیە.

**سێیەم:** لەڕێگەی ئەم پلانەوە، دەتوانین بنەبڕی زۆر کێشەی هەڵواسراو بکەین، کە چەندین ساڵە بەدەستیانەوە دەناڵێنین؛ بۆیە دەتوانین بەم پلانە بڵێین: (دایکی پلانەکان).

**چوارەم:** یەکێکی تر لە گرنگییەکانی ئەم پلانە، ئەوەیە کە بەپێی ناسنامەی هەر هاوڵاتییەك، هەر کەسێك ون ببێت، یان تووشی هەر حاڵەتێك ببێت، دەتوانین بیگەڕێنینەوە بۆ شوێنی خۆی، بەپێی ناسنامەکەی، دەزانین خەڵکی چ ناوچەیەکی سەر بەپارێزگاکانی کوردستانە.

**پێنجەم:** گەر دیقەتتان دابێت، هەموو بەشەکان، بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون مامەڵەمان لەگەڵ کرد، واتە: هەموو ئامارەکان، بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون دەزانینو کاری لەسەر دەکەین، بۆیە هەر لەسەرەتاوە، ئەو کۆدەی کە کارمان پێ کرد، بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون، کارمان لەسەر کرد.



# خۆت ژمێریاری خۆت بە !

حامید حسین

بەشی یەکەم

**بڕیاربدە تۆش سیستەمێکت هەبێت**

پیتر دراکر دەڵێت: «بناغەی بەڕێوەبردنی داهاتوو، لەسەر بڕیاردانو تێگەیشتنە لەم پرۆسەیە».

بڕیاردان، لە پرسە هەرە گرنگەکانی کارگێڕیو ئیدارەی هەر دامەزراوەو ڕێکخراوێکە، لەم ڕووەوە هەموو بیرمەندانی بەڕێوەبردن، ڕایان وایە کە بڕیاردان، یەکسانە بە بەڕێوەبردن، یان گرنگترین بەشو ناوەرۆکیەتی.

ڕوونە کە بڕیاردان، بە شێوەی کاریگەرو کارا، بەتایبەت لەم جیهانی پڕ لە گۆڕانو ئاڵۆزەدا، پێویستی بە زانیاریی وردو تەکنیکی هەیەو لە ڕاستیدا زانیاری، ئامرازو وەسیلەیەکی ستراتیژیی گرنگە بۆ بڕیاردان لە بەڕێوەبردنداو بێگومان کاریگەریی بڕیاری بەڕێوەبەریش پەیوەندیی بە ڕاستیو ڕوونی زانیارییەکان هەیە، کە لە کاتی بڕیارداندا بۆی بەردەستن.

بەربڵاوی گۆڕانکاریو ئاڵۆزییەکانی ناوخۆو دەرەوەی دامەزراوەکانو کۆمەڵگا، وردەوردە نیازی بەڕێوەبەرەکان بۆ بڕیاردانی ئاڵۆزتر دەخاتەڕوو، بەشێوەیەک کە ئەمڕۆ بەبێ بەردەستبوونی سیستەمێکی زانیاریی بەڕێوەبردن، بڕیاردان بە واتای زانستی، مەیسەر نابێت.

لە جیهانی تەکنەلۆجیای ئەمڕۆدا، پێویستە بەڕێوەبەرەکان بیر لە بە سیستەمکردنی دامەزراوەکانیان بکەنەوە، بۆ ئەم کارەش، تەنها پێویستیان بە هەڵبژاردنی سیستەمێکە، توانای وەڵامدانەوەی پرسیاری بەڕێوەبەرەکانی هەبێت.

بەگشتی سیستەمێکی تۆکمەو ستاندارد، ئەمڕۆ دەتوانێت بیرو هۆشت لە جەنجاڵیو ئاڵۆزیی کارەکان بپارێزێتو جووڵەو کاری ڕۆژانەت بەباشی بۆ ڕابگرێت، بەجۆرێك گەر داتاو زانیارییەکانی بە درووستی تێدا تۆمار بکرێت، دەتوانێت بە ڕێژەی ١٠٠٪ وەڵامی درووستت بداتەوەو بڕیاردانت خێراترو گونجاوتر بکات.

لەڕاستیدا هەڵبژاردنی سیستەمێکی گونجاو، پێویستی بە چەند تایبەتمەندییەکی سەرەکی هەیە، کە بریتین لە:

* ئاسانی بەکارهێنانو خێرایی کارەکان.
* یەکگرتوویيو وردبینیو پشتگیریی جووڵە بازرگانیو خزمەتگوزاریو کارگێرییەکان.
* چاودێریو دڵنیایی؛ بۆ پاراستنی زانیارییەکان.
* خزمەتگوزاریو ڕێنمایيو فێرکاری پێویست، لەلایەن دامەزرێنەر.

# ڕۆڵی پەروەردەو فێرکردن، لە گەشەسەندنی ئابووریدا

ئا: سەلاح عیسا _ خوێندکاری ماستەر- تورکیا

بەشی دووەم



## مانای پەروەردە

پەروەردە، ڕاهێنانی بیرو ڕەوشتە، نرخاندنی کەسێتیی تاکە لـە دەزگا فەرمییـە فێرکارییەکانـی وەك قوتابخانەو دامەزراوە پەروەردەییەکانی تـردا، هەر یـەك لـەو دەزگا پەروەردەییانە، بـۆ پەروەردەکردنـی تـاك، بەرپرسیارێتییەك هەڵدەگرێت؛ تا بگونجێت لەگـەڵ کۆمەڵگەو دەوروبەرەکەیـدا، بۆیە هەریەکێك لەمانە، پێویستـە ڕۆڵی خۆیان بەباشی ببینن؛ تا پەروەردەیەکی باشو تەندرووست، پێشکەش بە تاك بکەن؛ چونکە لە داهاتوودا، لە بەرهەمـی ئەمانەوە، مرۆڤێکی پەروەردەکراوو گۆشـکراو بە زانیارییەکان درووست دەبێت.

مانای پـەروەردە، هێنـدەی فراوانیی کۆمەڵـگاکان فراوانە، ئەمـەش بـەو مانایـە دێت، کـە هـەر کۆمەڵگەیـەك دەکرێت پەروەردەیەکـی تایبـەت بەخـۆی هەبێت، جیاوازیشـە هێندەی جیاوازی بیریارانو قسەکەرانی ئەو بوارە، هەروەها فرەڕەنگە بە قەد فرەڕەنگیی ئەو دامەزراوەو سیستـەمانەی کە بەرجەسـتەی کاری پەروەردە دەکەن.

لە پەرتووکو فەرهەنگی فەلسـەفیدا، واتـای پەروەردە بەم شـێوەیە هاتووە: بریتییە لە (گەیاندنی شتێك بە پلەی کەماڵو تەواوەتـی)، هـەروەك چۆن پێناسـەی زاراوەییی بـۆ کراوەو بە مانای زاراوەییەکەی واتە: (پەرەپێدانو گەشـەپێدان)، پەرەپێدان لە لایەنەکانی جەسـتەییو بیریو ڕەفتارییەوە، تاکو تاك توانای ژیـانو خۆگونجاندنـی هەبێت لەگەڵ ژینگـەو دەوروبەرەکەیدا. {ئیبراهیم ناسر، ٢٠١٣، لا ٣٣ }.

جـۆن سـتیوارت میل، پێی وایە هەرشـتێك کە بەسـەر تاکدا کاریگـەری هەبێت، ئەوە بە پەروەردە دادەنرێت، بەڵام جۆن دیوی وای دەبینێت: بەگشتی پەروەردە کۆمەڵە پرۆسەیەکە، گرووپ، یان کۆمەڵگایەك - چ گەورە بێت، یان بچووك - دەسەڵاتەکانی خۆی ڕا دەگوێزێتەوە؛ تا بتوانێت گەشەی بەردەوامیی خۆی مسۆگەر بکات.

ماکس ڤێبەریش پێی وایە، کە مەبەسـتی هەر سیسـتەمێکی پەروەردەیـی، ئەوەیـە خوێنـدکاران بـۆ بەڕێوەبردنی جۆرێکی ژیانی تایبەت ڕابهێنێت، ئەم جۆرە تایبەتەش بەپێی پلەو پێگەو ڕادەی دەسـەڵاتی کۆمەڵایەتیـی هـەر تاکێکە، لەنێـو پێکهاتەی کۆمەڵگەکەیدا. { ئامێدیان، ٢٠١٣، لا ١٥١ }.

ئیمانوئیل کانت پێی وایە: پەروەردە بەرزکردنەوەو پێشخستنی سەرجەم شـێوەکانی کەماڵە، کە دەکرێت، لەڕێگەی مرۆڤەوە ئەمە بکرێـت. بـەڵام جان جاك ڕۆسـۆ لەو بـاوەڕەدا بووە: پـەروەردە ئامادەکردنو ڕەخساندنی هەلە مرۆییەکانە؛ بۆئەوەی منداڵ گەشە بکات، لە ڕوانگەی ئارەزووو مەبەستەکانییەوە. هەروەها کۆمەڵناسی بەناوبانـگ ئەمیل دۆرکهایم، بەو شـێوەیە پەروەردە دەبینێت، کە پێکهاتووە لە پێکهاتنی کۆمەڵایەتیی تاکەکان، ئەم کارەش لە ڕێگەی ئـەو هەوڵانەوە بەرجەسـتە دەبێت، کە چینـە ڕێنموونیکارەکانی پێشـوو بـە ئەنجامیـان گەیاندووە، بـۆ ئەو چینانـەی تر کە لە ئاستێکی باشـی پێگەیشـتوویدا نەبوون، هەروەها پێی وایە ئەو مرۆڤەی کە پەروەردە، کاری لەسـەر دەکات، جیاوازە لەو مرۆڤەی سرووشـت بۆمانی درووست کردووە؛ چونکە مرۆڤی پەروەردەکراو مرۆڤێکە کۆمەڵگە چۆنی ویستووە، ئاوا درووستی کردووە.

هێربرت سپنسریش، پێی وایە پەروەردە هەموو ئەو شتانەیە، ئێمە لە پێناوی خۆماندا ئەنجامی دەدەینو گشت ئەو شتانەیە، کە ئەوانی دیکە لە پێناوی ئێمەدا دەیکەن.

ڕیفاعـە ڕافع تەهتاوی دەڵێت: پەروەردە بونیادنانی ڕەوشـتی منداڵە، بەشێوەیەك کۆمەڵگەیەکی چاکو سەربەستی لێ درووست بێت، کە تێیدا گەشە بدەین بە خوو ڕەوشتە چاکەکانی تاکو دوور بکەوینەوە لە ڕەوشتە خراپەکان. {ڕونییە اونیر، ١٩٧٩، لا ٢٢}.

بـەڵام لـە فەرهەنگـی زاراوەکانی کۆمەڵناسـیدا، پێناسـەی پەروەردە بەم شێوەیە هاتووە، کە ئامانجی ئامادەکردنی تاکەکانە، بـۆ ئەنجامدانـی ئەرکـە کۆمەڵایەتییەکەیان لە شـوێنو کاتێکی دیاریکـراودا، کە پێکدێت لە چەند قۆناغێكو چەند نێوەندێك کە بە دوو شـێوە ئەنجام دەدرێت، یەکەمیان بە شێوەی نافەرمی، کە خێـزانو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنو ماڵەکانی پەرسـتشو دەزگاکانی دیکەی کۆمەڵگە دەگرێتەوە، شێوەی فەرمیش ئەوەیە کە پەروەردە بەپێی فەلسـەفەو ئامانجگەلێکی دیاریکراوو ڕوون بڕوات بەڕێوە، وەك قوتابخانـەکانو دەزگا پەروەردەییەکانـی تـر کـە ئەرکـی پـەروەردەو فێرکردنی تاکیان لە ئەسـتۆیە، پـەروەردە یارمەتیی تاك دەدات بۆ بەدیهێنانی خواستـەکانی ئەویش لە ڕێگەی کرداری فێربوونەوە؛ چونکە تاك لەو ڕێگەیەوە دەتوانێت سەرجەم زانستو ئەزموونەکان وەربگرێت. {میراودەلی، ٢٠٠٧، لا ٩١ }.

## نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازیی ڕایەڵەدا (نێتۆرك ماركێتینگ)

### سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا

بەشی پێنجەم

# چەمکە پەیوەندیدارەکان بە نێتۆرکی مارکێتینگ

و: ئانا هەورامی



"گەورەترین دەرفەت"

لــەم قۆناغــەدا، ئــەوەی گرنگە، تێگەیشــتنە لــەو چەمکە جۆراوجۆرانــەی پەیوەندییان بە نێتۆرکــی مارکێتینگەوە هەیە. ئــەم کارە یارمەتیت دەدات کە بڕیارێکی درووســت، لەبارەی ئەم بازرگانییــەوە بدەیت، هەروەها یارمەتیت دەدات، کە بیروباوەڕت بەم بازرگانییە پتەوتر ببێت؛ تا بە سەرکەوتنی گەورەتر بگەیت.

گەشەی توانست، یان سەرکەوتن:

ئەلبێرت ئەنشتاین، گەشەی توانستی بە ناونیشانی هەشتەمین سەمەرەی دونیا داناوە. سەرودەرکردن لە هێزی گەشەی توانستو پەیوەندی لەگەڵNM، یارمەتیت دەدات، هەتا لێهاتویی شــێوازی کاری NM بزانیت. هەروەك لە بەشی یەکەمدا ڕوونمان کردەوە، بە پاشەکەوتکردنی تەنها یەك سەنت ڕۆژانەو دووبەرابەرکردنی ئەو پارەیە، لە کۆتایی ڕۆژی ســیو یەکەمەدا، زیاتر لە دە ملیۆن دۆلارتان دەبێت.

بە گشتاندنی ئەم بنەمایە، بەسەر کەسانی ناو کۆمەڵەکەتاندا دەتوانن هێزی بێسنووری گەشەی توانست بەدەست بهێنیت. هەر بەهۆی ئەم هۆکارەیە، کە پێشەواگەلێك لە کاری NM توانیویانە بۆ خۆیان کۆمەڵەگەلێکی گەورە، لە ئەندازەی چەند هەزاری، یان دەیان هەزاری، یاخود سەدان هەزار کەسی بونیاد بنێن.

نێتۆرك مارکێتینگ، بازرگانیی هاوشێوەسازییە:

بازرگانییەکــی ئاســان، کە تێیدا کەســانی ئاســایی دەتوانن داهاتگەلی زۆر زیاد بەدەســت بهێنن. بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، پێویســتە چاولێبڕی ڕەسەن بیتو کەسانی تریش فێربکرێن. کە هەر بەو شێوەیە بن. پێویســتە ڕەوتێکی هاوشێوەسازیی گونجاو لە کارەکەدا هەبێت؛ تا هەرکەسەو لە کۆمەڵەکەدا، چ تازەکارو چ کۆنەکار، توانای پەیڕەوکردنی سیستەمەکەی هەبێتو هەمان ئەو کارانە بە ئاسانی ئەنجام بدات.

NM بازرگانییەکی جیهانییەو پێویســتە بۆ هەموو کەســێك لــە نــاو تــۆڕە ئەلیکترۆنییەکەدا، بە چاوپۆشــی لە پێشــینەی خوێندنی، ئەزموونو شــوێنی جوگرافیایی، سیســتەمێکی سادەی بۆ پەیڕەویکردن هەبێت.

بۆئــەوەی هاوشێوەســازی، کاریگــەر بێــت؛ پێویســتە ئەم بنەمایانەی خوارەوە هەبن:

١- پێویستە سیستەمێك لە کاردا بێت:

ئــەم تایبەتمەندییــە یارمەتیی هەموو کەســەکان دەدات بۆ پەیڕەویکردنی شــێوازێکی ســەرکەوتن، کە پێشــتر پێشــەنگو پێشەواکان تێیان پەڕاندووە. ئەم کارە، لەسەر بنەمای ئەوەی کە ڕێگایەك بۆ پێشــکەوتن فەراهەم دەکات، بەتایبەت بۆ ئەندامانی نوێ سوودمەند دەبێت.

سیستەمەکە، بەستراوە بە پێشەواکانی کۆمەڵەکەوە، لەوانەیە ســادە، یان ئاڵۆزبێــت. لەوانەیە ئەم بابەتانەی خــوارەوە لەخۆ بگرێت:

- کۆبوونەوەی فێرکاری، خولی جیاواز، سیمینارو بابەتی فێرکاری.
- شێوازێك بۆ وێناکردنی پێشنیاری دانەوەی قەرز.
- خوێندنەوەی بابەتی خوێنراوو ســوودوەرگرتن لە هۆکاری بیستراو-بینراو.
-پاداشتو ڕێزلێنان.

٢- پێویستە پەیڕەویکردنی سیستەمەکە ئاسان بێت.

ئەم پێــوەرە، بەهایەکی فراوانیی هەیــە؛ چونکە ئەندامانی کۆمەڵەکــە، لــە ڕوانگــەی پێشــینەی خوێندن، بــاری ئابووری، ئەزمــوون، ڕادەی هۆشــیاریو بڕوانامە لە ئاســتی جیــاوازدان. بە مەبەســتی بونیادنانی کۆمەڵەیەکی گەورە، پێویســتە هەموو کەســێك لە کۆمەڵەکــەدا، توانای پەیڕەویکردنی سیســتەمەکەی هەبێت.

٣-پێویستە سیســتەمەکە لە هەموو جێگایەکدا یەکسان بێت چاوپۆشــیکردن لە وڵات، یان پێگەی جوگرافیایی، سیســتەمەکە پێویستە لە هەموو جێگایەکدا یەك شێوە بێت. ئەم یەکشێوەییە، زۆر گرنگە بــۆ دڵنیایی لە جووڵەی هەمیشــەیی بازرگانییەکەو ناســنامەی کۆمەڵەکــە. ئایــا دەتوانــن بهێننــە بەرچاوتان، کە چــی ڕووی دەدا، ئەگــەر هێمای بازرگانــیو پێکهاتەی ماکدۆناڵد (McDonald) لــە شــوێنە جیاوازەکانــدا، جیــاواز بوایــە؟ بەدڵنیاییەوە ئەم بابەتە سەری دەکێشا بۆ تێکچوونو شێواوی.

لە سەردەمی کۆلۆنێل ساندەرس(Sanders)دا، دامەزرێنەری Kentucky Fried Chicken هەتا ئێستا، مافی نوێنەرایەتی بەباشی جێگای خۆی کردووەتەوە. لە ڕاستیدا، لە سەرەتادا مافی نوێنەرایەتی، هەم لەلایەن زۆرینەی خەڵکو هەم لەلایەن بەرپرسانی دەوڵەتەوە، کەوتۆتە بەر هەڵمەتو هێرشەوە. خۆشبەختانە، مافی نوێنەرایەتی توانیی بەسەر ئەم هێرشانەدا سەرکەوتوو بێتو لەم سەردەمەدا هەزاران کۆمپانیاو بازرگانی، لەژێر ناوی چەمکی نوێنەرایەتیدا، سەرقاڵی چالاکین. مافی نوێنەرایەتی، چەمکێکی بەهێزو سەرکەوتووە.

ئەگەر هەر بازرگانییەك، تەنها لەیەك شوێندا سنووردار بێت؛ توانای گەشەی نابێت، بەڵام بە هەبوونی هەزاران گرووپی هاوشێوە، کە لە ژێر ئیمتیازێکی هاوشێوەدا چالاکی دەکەن، ئەگەرێکی بەهێزی گەورە درووست دەبێت، کە دەتوانین لە ماکدۆناڵد، KFC، Seven Elevenئەوە ببینین.

گەشە لە نوێنەرایەتییەکاندا، هێندەش خێرا نییە؛ چونکە لە سەر بنەمای گەشەی هێڵییە، ئەمەش بەهۆی ئەو بڕە زۆرەی پارەوەیە، کە بۆ ئەم کارە پێویستە. لە نێتۆرکی مارکێتینگدا، گەشەی کۆمەڵە، لەسەر گەشەی توانست، یان سەرکەوتن بونیاد نراوە، بەوەش هەرکەس دەتوانێت بە پارەیەکی زۆر کەمی سەرەتاوە، بازرگانیی خۆی دەست پێ بکات. مەترسییەکەشی زۆر کەمە. لە ئەنجامدا، بە ئاوێتەبوونی مافی نوێنەرایەتیو گەشەو سەرکەوتن، لەحاڵی حازردا، بەیارمەتیی ئینتەرنێت، NM شێوەیەکی بازرگانییە، کە دەبێت بە جددی وەربگیرێت.

چەمکی بەرزبوونەوە، لە هەر جۆرە چالاکییەکی بازرگانیدا گرنگە. دوو هۆکاری بەناو بانگی بەرزبوونەوە هەیە، "کات"و "پارە". هەرکەسێك، یان دامەزراوەیەك، لە ڕووی کاتو پارەوە سنووردارە. لەبەر ئەوە پێویستە لە هۆکاری بەرزبوونەوەی کاتو پارەی کەسانی تر، سوود وەربگرێت.

بە وتەی (و. کالمنت ئاستۆن)، "باشترین پارەیەك کە دەکرێت لە بازرگانییەکدا، سوودی لێ وەربگیرێت.OPM""

(پارەی کەسانی ترOther Peoples Money)ە. لە NM دەتوانین لەم هۆکاری بەرزبوونەوانەی تریش سوود وەربگرین:

OPT کە کورتکراوەی ئەم دەستەواژانەی خوارەوەیە:

کاتی کەسانی تر (Other Peoples` Time)

توانای کەسانی تر (Other Peoples` Talent)

تەکنیکی کەسانی تر (Other Peoples` Techniques)

OPE کە کورتکراوەی ئەم دەستەواژانەی خوارەوەیە:

وزەی کەسانی تر (Other Peoples` Energy)

ئاستی خوێندنی کەسانی تر (Other Peoples` Education)

تامەزرۆیی کەسانی تر (Other Peoples` Enthusiasm)

نێتۆرکی مارکێتینگ، دەردراوی هێزی کەسەکانە. کەسانی تر گەورەترین سەرچاوەکانی ئێمەن. سەرچاوەگەلێك کە بەفراوانی دەست دەکەون.

### کات

هەموو کەسێك - هەژار، یان دەوڵەمەند - لە شەوو ڕۆژێکدا تەنها ٢٤ کاتژمێر کاتی لە بەردەستدایە. بۆ زۆربەی خەڵکی، بەهۆی ڕادەی کار، یان کاری زیادە، ٨ کاتژمێر کار، کاتی ستانداردی کارکردنە. بەم شێوەیە، ئێمە بەپێی زۆرینە، ٨ کاتژمێر کارکردن، لەبەرچاو دەگرین. ئەگەر لە هەفتەیەکدا ٥ ڕۆژ کاربکەیت، ٤٠ کاتژمێر؛ کاتی بەسوود لە بەردەستدایە.بەم پێیە، لە ٥٠ هەفتەی ساڵدا (دوو هەفتە بۆ پشووەکان دەخەینە لاوە)، ٢٠٠٠ کاتژمێر کاتت هەیە. بەدرێژایی ژیانتان، ئەگەر ماوەی ٤٠ ساڵ کار بکەیت، تەنها ٨٠٠٠٠ کاتژمێر لە بەردەستتدایە. کاتێکی زۆر نییە. بەتایبەت ئەگەر تۆ ئێستا لە نیوەی تەمەنەنتدا بیت. لە نێتۆرکی مارکێتینگدا، ئەگەر تۆ دوای چەند ساڵێك، ٢٠٠٠٠ کەست لە کۆمەڵەکەتدا هەبێتو وا دابنرێت کە هەریەکە لەوانە لەڕۆژێکدا تەنها ٨ کاتژمێر کاربکەن، تەنها کاتژمێرەکانی کارکردنیان لە یەك ڕۆژدا دەکاتە تێکڕای دوو بەرابەری تەمەنی تۆ. واتە: ١٦٠٠٠٠ کاتژمێر. هیچ کات نابێت بە سوودوەرگرتن لە کاتی خۆت، بە ئاوا ژمارەیەك بگەیت. ئەمەش کرۆکی بەرزبوونەوەیە. ئێستا چ لەبارەی کاتەوە بەکار بهێنرێت، چ لەبارەی پارەوە.

### داهاتی تێکەڵ

لە بنەڕەتدا سێ جۆر داهات هەیە:

١-داهاتی هێڵی (Linear Income)

٢-داهاتی پاشماوە (Residual Income)

٣-داهاتی تێکەڵ، یان بەرکاری (Multiplex or Passive Income)

کەسێك کە داهاتی هێڵی هەیە، ناچارە کە کاتەکەی لەگەڵ پارەدا ئاڵوگۆڕ بکات، هەتا کاتی زیاتر دابنێت؛ داهاتێکی زیاتری دەبێت. هەڵبەتە نرخی کاتی ئەو، بەپێی ئەزموونە، ئاستی خوێندن، بارودۆخو شایستەیی ئەو کەسە جیاوازە، بەڵام بە هەرحاڵ، هەرچەندیش کە داهاتی هەبێت، پێویستە بۆ بەدەستهێنانی داهات، کاتی خۆی بفرۆشێت. ئەم کەسانە هەم ئەوانە دەگرێتەوە، کە بۆ کەسانی تر کار دەکەن، هەم ئەوانەش دەگرێتەوە، کە بۆ خۆیان کار دەکەن. ئەوەی کە لەبارەی ئەم کەسانەوە ڕاستو چەسپاوە، ئەوەیە کە هەر کاتێك کە دەست لە کاربکێشیتەوە، ڕاستەوخۆ داهاتیشیان دەوەستێت.

ئەوانەی کە داهاتی پاشماوەیان هەیە، بارودۆخیان باشترە؛ چونکە ئەگەر کارەکەشیان بوەستێنن، دیسانەوە هەر داهاتیان دەبێت. گەرچی کە دوای چەند ڕۆژێك، داهاتی ئەوانیش دەوەستێت. نموونەیەکی ڕوونی ئەم کەسانە، بریتییە لە کەسانی بیمەکراوو کرێکارانی پیشەسازیUnit Trust.

لە شێوازی نێتۆرکی مارکێتینگدا، کاتێك کە بەسەرکەوتن بگەیت، توانای بەدەستهێنانی داهاتی تێکەڵت دەبێت. ئەمە بەو مانایەیە، کە هەرکات"هێڵی لوولە"ی تۆ ئامادە بێت، واتە: کۆمەڵەکەی تۆ بە ئەندازەی کافی گەورەو بەهێز بووە، چ کار بکەیت، چ کار نەکەیت، سەرچاوەی داهاتی تۆ، هەمیشەیی دەبێت، ئەم بازرگانیو داهاتە قابیلی گواستنەوەش هەیە، دەتوانن بیگوازنەوە بۆ هاوسەرو منداڵەکانیشتان. لەبەر ئەم هۆکارەیە، کە زۆر کەس درگیان بە بەهێزیو جیاوازی کارو پیشەی NM کردووەو بەشێوەیەك، کە ڕوو لە زیادبوونە، مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.



# فێربوونی زمانێکی دیکه

پەیام

هەموو ڕۆژانێکی هەینی، نەوەکانیان دەهاتنەوە بۆ لایانو ئەو ڕۆژەیان بە کۆمەڵ لە ماڵی باپیرەو داپیرە زۆر بەخۆشی بەسەر دەبرد.. هێژا زۆر حەزی بە ڕۆژانی هەینی دەکرد، لەبەرئەوەی چاوی بە کچە مامەکەی نێرگزو کچەپوورەکەی سەناریا دەکەوتو ئەو ڕۆژەیان پێکەوە بەسەر دەبردو لە ماڵی داپیرەو باپیرەیان، بە یاریو گاڵتەکردنو قسەی خۆش، تا خۆراوابوون بە خۆشی بەسەر دەبرد..

هەینییەکیان هەموان ئامادەبوون، بەڵام باوکی نێرگز هاتو نێرگزی لەگەڵدا نەبوو، هێژاو سەناریا بەپەرۆشەوە ڕۆیشتن بۆ لای مامەیانو پێیان گوت: مامەگیان نێرگز لە کوێیە؟ بۆچی لەگەڵ خۆتدا نەتهێناوە؟

مامەیان گوتی: گوڵەکانم، نێرگز چووەتە خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی، ڕەنگە کەمێکی دیکە لەگەڵ دایکیدا بێت بۆ لاتان.

سەناریا گوتی: بۆچی ئینگلیزی دەخوێنێت، زمانی ئینگلیزی زمانێکی قورسو نامۆیە؟

مامی گوتی: نا، سەناریا.. هیچ شتێك بۆ فێربوون قورس نییە، مرۆڤ گەر بیەوێت شتێك بە دەست بهێنێت، گەر ورەی بەرز بێتو متمانەی بە خۆی هەبێت، بە دڵنیاییەوە دەتوانێت فێربێت، لەگەڵ ئەوەشدا فێربوونی زمان بەسوودەو مرۆڤ چێژی لێ دەبینێت.

هێژا گوتی: مامە بۆچی؟ ئایا زمانی دایك بەس نییە، قسەی پێ بکەینو تێیدا شارەزا بین؟ بۆچی زمانی بێگانە فێر ببین؟

مامی گوتی: نەخێر، بەڵکو فێربوونی زمانی دیکە، وات لێ دەکات، بتوانیت ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە، کە بە زمانی ئینگلیزی دانراون، دەتوانیت سوود لە زانستو ئەزموونی گەلانی جیهان وەربگریت، مرۆڤ چەند زمان بزانێت؛ ئەوەندە کەسە!

لەو کاتەدا نێرگز لەگەڵ دایکیدا هاتن بۆ ماڵی باپیرەو سڵاوی لێکردن.

هەموان بەخێرهاتنیان کردنو بەگەرمی وەڵامی سڵاوەکەیان دایەوەو هەواڵی خولەکەیان لێ پرسیو پێیان گوت: ئایا وانەکانت قورسە؟

نێرگز گوتی: بە پێچەوانەوە، وانەکانمان زۆر بەسوودن، من زۆر سوودم لەو خولە بینیوە..

ئیدی سەناریا گوتی: منیش بە باوکم دەڵێم: کە مۆڵەتم بدات لەگەڵ تۆ بێم بۆ خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی..

بەڵام هێژا حەزی نەکرد، بەشداری خولەکە بکات، وتی: من هەست دەکەم، کە زمانی ئینگلیزی بۆ من سوودی نییە.

ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، سەناریاو نێرگز، پێکەوە دەڕۆیشتن بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزیو گرنگیی زۆریان پێ دەداو زۆر سوودیان لێ دەبینیو دواجار دەیانتوانی پێکەوە بە زمانی ئینگلیزی بدوێن..

ڕۆژێکی هەینی، هەروەکو نەریتی خۆیان، لە ماڵی باپیرەو داپیرە کۆبوونەوە، کچان پێکەوە لەگەڵ پشیلەکەیان لە باخچەی ماڵەکەیان یارییان دەکرد، هێژا قوتوویەکی دۆزییەوە لەسەری نووسرابوو (This Eating For Cats)، هێژا نەیزانی ئەوە چ مانایەکی هەیە، کەلەسەر قووتوەکە نووسراوە، سەیری کرد ناو قوتوەکە خواردنی تێدایە، دەستی کرد بە خواردنی بە لایەوە خواردنێکی بەتامو خۆش بوو، بانگی سەناریاو نێرگزی کردو گوتی: سەیرکەن چیم دۆزییەوە، خواردنێکی زۆر خۆشو بەتامە لێی بخۆن، بزانن چەند خۆشە!

بەڵام کاتێك سەناریاو نێرگز سەیری قوتووەکەیان کردو نووسینەکەیان خوێندەوە، گوتیان: هێژا، ئەمە خواردنی ئێمە نییە، خواردنی پشیلەیە، ئایا لێت خواردووە؟

پێش ئەوەی وەڵام بداتەوەو بڵێت: بەڵێ، هاواری کرد ئای سکم، ئای سکم، ئاه، ئاه.. دایکی بەدەمیەوە هاتو بەپەلە بردی بۆ نەخۆشخانە.. ئەو کاتە بیری کردەوەو گوتی: ئەگەر منیش لەگەڵ نێرگزو سەناریادا بڕۆیشتمایە بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی؛ ئەوا خواردنی پشیلەکەم نەدەخوارد!!

رۆشنبیریی تەندروستی!

# نەخۆشییە سێکسییەکان ٢/١



ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

* پێشەکی:

گومانی تێدا نییە داوێنپیسیو بەدڕەوشتی، دەبن بەهۆی گەلێك نەخۆشیو دەردی کوشندەی جۆراوجۆر، بەڵام پاکداوێنیو هاوسەرگیرییەکی ڕێزدارانە، هەرگیز نابن بەهۆی هیچ کام لەم دەردانە.

جێی سەرسامی نییە، دوو دەردی زۆر کوشندە بڵاوە لە ئەمریکاو ئەوروپا: نەخۆشییە سێکسییەکانو دووگیانبوونی ناشەرعی(لەدەرەوەی بازنەی هاوسەرگیریی)! ئەو کێشانەی بەهۆی ئەم دوو دەردەوە سەرچاوەدەگرن، لە ترسناکترین ئەو کێشانەن، کە بەرۆکی ئەمریکای گرتووە.

توێژینەوەکان دەریدەخەن:

- ساڵانە زیاد لە (٩٠٠٠٠٠) کچە هەرزەکاری ئەمریکی، بەشێوەیەکی ناشەرعی دووگیان دەبن.
- خوێندکارانی ئامادەیی ئەمریکا، سێ یەکیان کهوول دەخۆنەوە، ، (٥٢٪)یان ماریجوانا بەکار دەهێنن، (٦١٪)یان ماددە هۆشبەرەکان بەکار دەهێنن.
- (٦٣٪) ی هەرزەکارانی ئەمریکا، دایكو باوکیان تاوانبار دەکەن بەوەی لەسەر زیانەکانی ماددە هۆشبەرەکان قسەیان بۆنەکردوون!

با ئەو کەسانە ئاگادار بن کە شەیدای شارستانێتیی ئەمریکین، دەیانەوێت داهاتووی منداڵەکانیان بەرەو کوێ بڕوات؟

کێشەش ئەوەیە ئەم نەخۆشییانە دەکرێت لە باوكو دایکەوە بگوازرێنەوە بۆ منداڵە بێگوناهەکانیان! ئەم نەخۆشییانەی لە خوارەوە باسیان دەکەین، ئەو نەخۆشییانە دەگرێتەوە، کە بەهۆی میکرۆبەوە ڕوو دەدەنو لەڕێی سێکسی ناشەرعییەوە دەگوازرێنەوە.

## أ. نەخۆشییە گوازراوەکان لەڕێی سێکسەوە (sesaesid dettimsnart yllauxeS)

### ١. نەخۆشیی سەیلان (aehrronoG):

لە جیهاندا، بە بڵاوترین نەخۆشییە سێکسییەکان دادەنرێت، بەجۆرێك ساڵانە زیاد لە (٢٦ ملیۆن) کەس تووش دەبێت لە جیهاندا، نیوەی تووشبوون لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ڕوو دەدات، بەهۆی زۆری ئەو گەشتیارانەی بۆ ئەنجامدانی سێکسی نەخوازراو، ڕوو لە تایلەندو چواردەوری دەکەن.

ئەم نەخۆشییە، لە ڕێی پەیوەندییە سێکسییە نەخوازراوەکانەوە دەگوازرێتەوە، تەنانەت زیادەڕۆییکردن لە ماچکردنو لە باوەشگرتن ڕەنگە بیگوازێتەوە.

ئەم نەخۆشییە هۆکاری سەرەکیی هەوکردنی میزەڕۆیە لە پیاواندا، لەئەنجامدا کێمو جەراعەت دێتە دەرەوە هاوڕێ بە ئازارو سووتانەوە لەگەڵ میزکردن.. لە ئافرەتانیشدا دەبێت بەهۆی هەوکردنی ملی منداڵدانو هەوکردنە درێژخایەنەکانی حەوزو نەزۆکی.

### ٢. نەخۆشیی زوهری(silihpyS):

دەگوازرێتەوە لەڕێی ئەنجامدانی سێکسی ڕێپێنەدراو، هەروەها لەڕێی ماچکردن لەگەڵ کەسێك لێوی تووشبووبێت.

ئەندامێك نامێنێت لەلەشدا ئەم نەخۆشییە نەیگرێتەوە، هۆکاری ئەم نەخۆشییە، بەکتریایەکە بەناوی (mudillap amenoperT).

یەکەم نیشانەی تووشبوون دەرکەوتنی برینێکی قووڵە لەسەر ئەو ئەندامەی لەڕێیەوە سێکسەکە ئەنجام دراوە، پاش (١٠ -٩٠) ڕۆژ لە ئەنجامدانی.

زوهری خۆی لە دوو قۆناغدا نیشان دەدات: تیژ(etucA)و درێژخایەن(cinorhC)، گەر لەقۆناغی تیژ چارەسەر نەکرێت؛ دەچێتە قۆناغی درێژخایەن، پاش چەند ساڵێك هێرش دەکاتە سەر هەموو ئەندامەکانی لەش.

زیاترین وڵاتیش کە ناسراوە بە زوهریو بەردەوام لە زیادبووندایە ڕووسیایە!

### ٣. نەخۆشیی ترایکۆمۆناس(esaesid sanomohcirT):

بڵاوترین نەخۆشیی سێکسییە لە ئافرەتاندا، بەجۆرێك (١٧٠ ملیۆن) کەس دەگرێتەوە لە جیهاندا.

بەهۆی مشەخۆری (silanigav sanomohcirT)ەوە ڕوودەداتو دەگوازرێتەوە لەڕێی سێکسی ڕێپێنەدراوەوە، دەبێتە هۆی هەوکردنی زێو ملی منداڵدانو میزەڕۆ، لە پیاوانیشدا هەوکردنی میزەڕۆو پرۆستات.

### ٤. هەوکردن بە کلامیدیا (sitiretU laidymalhC):

نەخۆشییەکی بڵاوە، دەبێت بەهۆی هەوکردنی میزەڕۆو ملی منداڵدانو دەوروبەریان، دەرهاویشتنی کێمو جەراعەت.

یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی نەزۆکی، دوگیانبوونی دەرەوەی منداڵدانو هەوکردنی درێژخایەنی حەوز.

ساڵانە (٩٨ ملیۆن) کەس تووش دەبن لە جیهاندا، لەوانە (٤٠ ملیۆن)یان لە باشوورو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ڕوو دەدەن، کە بارو جێگەکانی داوێنپیسی زۆر بەربڵاوە.

لە ئەمریکا: (٤ ملیۆن)کەس، ساڵانە تووش دەبن، (٥-٢٠٪)ی لاوانیان دەگرێتەوە. زیانی ئابووری بۆ ئەمریکا ساڵانە (٢ ملیار) دۆلارە.

زیاتر ئەم نەخۆشییە لە لاواندا ڕوو دەدات، بەتایبەت ئەوانەیان کە هاوسەرگیرییان نەکردووە.





# کـــــاری

# Curry

کاری **Curry** یەکێکە لەو بەهاراتەی کە چێشتخانەکانی ئاسیای پێ جیا دەکرێتەوە، بەتایبەتی هندستان، ئەوەش بەهۆی ئەو تامو بۆنە تایبەتەی کە نهێنی خۆشی خواردنەکەیە، بەم دواییانەش بەشێوەکی بەرفراوان بڵاوبوویەوە لە ئەوروپا بەهۆی بەکارهێنانی لە بواری پزیشکیداو بوونی پێکهاتە سوودبەخشەکان تێیدا زیاتر پەرەی سەند.

ڕۆژئاواییەکان چەند بەهاراتێك تێکەڵ دەکەن؛ بۆ ئەوەی هەمان تامی کاری بدات، پێی دەگوترێت (ماسالا)، ئەو بەهاراتانەش (زەردەچەوە، زەعفەران، تۆوی کونجی، مێخەك، کەرەوزی وشکی هاڕاو، زیرە) تێکەڵکردنی ئەمانە، تەنها بۆ ئەوەیە بەهاراتێك پێك بێت، هەمان تامی کاری هەبێت.

**بەهای خۆراکی لە کاریدا:** گەڵای کاری چەندین توخمی خۆراکی گرنگی تێدایە. ئەوانیش: کالیسیۆم، مەگنیسیۆم، فسفۆر، مس، ئاسن، ڤیتامین **A**، ڤیتامین **B**، ڤیتامین **C**.

## سوودەکانی کاری

**یەکەم: باشترین چارەسەری نەخۆشیی زەهایمەرە:** لە نوێترین لێکۆڵینەوەدا دەرکەوتووە، کاری بەناوبانگترین بەهاراتە لای هندیو چینییەکان، تەنها لە بواری خواردندا بەکاری ناهێنن، بەڵکو لە بواری پزیشکیشدا زۆر بەکاری دەهێنن، کاری هانی کۆئەندامی بەرگری دەدات، بۆ لەناوبردنی ئەو ترشە ئەمینییەکان، پاشانیش ڕێ دەگرێ لە شێوانو تێکچوونی زانیاریو هەلی تووشبوون بە نەخۆشیی زەهایمەر کەم دەکاتەوە، لێکۆڵینەوەکەش باس لەوە دەکات هندستان لە یەکەمینەکانی ئەو وڵاتانەن، کە زۆرترین بەکارهێنانی کاری هەیەو لە هەمان کاتیشدا کەمترین تووشبووی بە نەخۆشیی زەهایمەر هەیە.

**دووەم: چارەسەری شەکرە:** کاری یارمەتیی دابەزاندنی ئاستەکانی شەکرو هێشتنەوەی لە بارێکی جێگیردا دەدات، هەروەها کاریگەری لەسەر چالاکیی ئەنسۆلین لەخوێنداو کەمی دەکاتەوە.

**سێیەم: پاراستن لە کەم خوێنی:** کاری دەوڵەمەندە بە ئاسنو ترشی فۆلیك. ئەوانیش یارمەتیی لەش دەدەن لە قەرەبووی کەمیی ئاسن، زۆرچالاکیشە لە چارەسەری کەمخوێنی.

**چوارەم: باشکردنی کرداری هەرس:** کاری ڕێگەی مژینی چەوری لەلایەن لەشەوە دەگۆڕێت، ئەوەش هانی زیندەکردارەکان لە لەشدا دەداتو یارمەتیدەرو چالاککەری دابەزاندنی کێشیشە، سەرەڕای ئەوەش خواردنی کاری کۆئەندامی هەرس تەندرووستو چالاك دەکات.

**پێنجەم: بۆ دڵ بەسوودە:** کاری، پێکهاتەیەکی دەوڵەمەندە بە دژە ئۆکسێنەرەکان، کار لەسەر دابەزاندنی ئاستی کۆلیسترۆڵی زیانبەخش دەکات، دواتریش پارێزگاری لە تەندرووست هێشتنەوەی دڵ دەکات، هەروەها بەهۆی بوونی ماددەی کیورکیومینی کیمیایی دەبێت بەهۆی ڕێگریکردن لە ڕەقبوونی خوێنبەرەکان.

**شەشەم: ڕێگری لە سپیبوونی قژ دەکات:** گەڵای کاری دەرکەوتنی مووی سپی کەم دەکاتەوە، هەروەها چارەسەری لاوازیی مووەکە دەکاتو بەهۆی بەهێزکردنی سەلکی مووەکە، زیندوویتی بۆ دەگەڕێنێتەوە، سەرەڕای چارەسەری کرێشی سەر، بەهۆی خواردنی کارییەوە بێت، یان لە ڕێگەی چەورکردنی پێستی سەر بێت هەر بەسوود دەبێت.

**حەوتەم: بۆ چارەسەری سەرئێشە:** کاری، بۆ چارەسەری سەرئێشە لە ئەسپرین باشترە، کە بۆ ژانەسەر بەکار دەهێنرێت، هەروەها لە بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن دەیپارێزێت.

**هەشتەم: کاری دژی شێرپەنجە کار دەکات:** خواردنی هاڕاوەی کاری لە سیستەمی خۆراکی، بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو ڕێکخراو ئەگەری پاراستنی دژی شێرپەنجەی هەیە، بەپێی لێکۆڵینەوەیەك لە ئۆکتۆبەری ٢٠١٢ لە گۆڤارێکی کۆری، باس لە سوودی کاریو زەردەچەوە دەکاتو دەڵێت: توانای وەستاندنی شێرپەنجەی هەیە، کاتێك لەسەرەتای قۆناغەکانیدا بێت، لێکۆڵەران هەوڵی ئەوە دەدەن، کاریو زەردەچەوە بەشێوەیەك لە شێوەکان، وەك دەرمانی سرووشتی بۆ نەخۆشیی شێرپەنجە گەشە پێ بدەن، لەبەر ئەوەی کاری، لە توانایدایە کار لە کرۆمۆسۆمێك کە دەبێت بەهۆی درووستبوونی هەوکردنو شێرپەنجەو گەشەی گرێی سەر جگەر.

**نۆیەم: بۆ چارەسەری ئازارو هەوکردن:** کاری ڕەوشتی دژەهەوکردنی تێدایەو هەوکردنێك کە چالاك بێتو تەشەنە بکات کەمی دەکاتەوە، بەتایبەتی هەوکردنی جومگەکان، سەرەڕای کەمکردنەوەی ئازاریش، هاوشێوەی ئەسپرینو باشتر لە ئەسپرینیش کار دەکاتو کاریگەریی لاوەکی نابێت، ئەگەر زۆر بەکار بهێنرێت بەراورد بە ئەسپرین، کە زۆر بەکارهێنانی کاریگەریی لاوەکی هەیە. بێگومان بەکارهێنانی ماددەی ئەندامی زۆر بەسوودترە لە بەکارهێنانی ماددەی کیمیایی وەك دەرمان، هەروەها ئەو بەکتریایانەی لە ڕیخۆڵەدا دەبن بەهۆی هەوکردن لەناو دەبات، بەتایبەتی کۆڵۆن.

www.rjeem.com
healthyeating.sfgate.com
www.livestrong.com



# ڕۆحی دین

و: ئاسیا سەڵاح

ئێمە لەسایەی بەخشندەیی خودای گەورەوە، نوقمی نیعمەتەکانی باوەڕو ڕێنموویکردنی ئەوین، سوپاسگوزاریی ئەم نیعمەتە گەورەیە، بە کارلێککردن دەبێت لەگەڵ بەرنامەی خوداداو بکرێت بە ڕێبەر بۆ هەموو بابەتەکانی ژیان. ڕۆڵەکانم، دەرئەنجامی هەموو پەرستشەکان لە ئیسلامدا، لەیەك شتدا کۆ دەبێتەوە، ئەویش پاڵپشتیکردنی واتای بەندایەتییە لە دەروون، ئەقڵ، ڕەفتارو پتەوکردنی پەیوەندییە بەخوداوە لە باوەڕداردا، کە خودای خۆش دەوێت، لێی دەپاڕێتەوە، شەرمی لێ دەکات، لێی دەترسێتو هەست بە پێکەوەبوونی دەکات، ئەوپەڕی توانای دەخاتە گەڕ؛ بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی، پابەندی فرمانەکانییەتیو لە قەدەغەکانی خۆی دەگرێتەوە. من نامەوێت لێرەدا ئەو فەرموودەو ئایەتانە بخەمە ڕوو، کە ئاماژە بەم چەمکە دەدەن، دەمەوێت بڵێم کە سەرباری بەرەو پێشچوونی چەندین بواری وشیاری، هزر، زانستو ئابووری و...هتد، بەڵام لایەنێکی زۆر گرنگ هەیە، کە تووشی سیسبوونو پوکانەوە بووە، ئایا دەزانن ئەو لایەنە چییە؟ ئەوە لایەنە ڕۆحییەکەیە، کە هەستکردن بە پێکەوەبوونی خودای گەورەی بەدیهێنەر دەکەیت، لەگەڵ ئامادەگیی شکۆدارانەی لە دڵو ڕۆحماندا.

هۆکاری ئەمەش، سەرقاڵی ئێمەیە بە کاروباری ڕۆژانەوەو ئاڵۆزبوونی ژیانی سەردەمەکەمانە، هەروەها ئەو هەموو هۆکاری کات بەسەربردنو ڕابواردنو خۆش کەیفییەی کە هاتۆتە کایەوە، لەمەوبەر بەم چەشنەی ئێستا نەبووە، وێڕای ئەمانەش، ئەو تەوژمە ئارەزووبزوێنەش لەبیر مەکەن، کە خۆی کردووە بە هەمووماڵێکداو جێی خۆی کردووەتەوە.

خۆشەویستانم، مرۆڤ ئافەریدەیەکی لاوازە، زۆر ئاسانە هەست بە ترسو ئاوارەیی بکات، بۆیە هەمیشە پێویستی بە چەترێکی ئاسایش هەیە، کە خۆی پێ بپارێزێت لە هەڕەشە نادیارەکانو گوشاری هۆکارە ماددییەکان، هیچ شتێکیش هێندەی پەیوەندی بە خوداوە جێگای ئەو چەترە ناگرێتەوە، من قەوارەی ئەو چەرمەسەرییانە دەزانم، کە ڕۆڵەکانم لە ژێر باریدا دەناڵێنن، لەم جیهانەی کە پڕە لە گومان، ئارەزووەکان، فریودان، ئاڵۆزی...هتد، هەر ئەوەشە کە بەتەواوی وای لێ کردم، جەخت بخەمە سەر لایەنە ڕۆحییەکە، دڵنیاش بن کە هەموو تواناکانی سەرکەوتن هەیەو گەورەن، بەڵام بە مەرجێك کە گوێبیستی ڕێبەرەکەمان ببین، بەپەرۆشیو گرنگیپێدانەوە ڕێنموویەکانی وەربگرین. گەلێك لە گەنجانی ئەم نەتەوەیە، بەکوڕو کچیانەوە، ڕێ دەکەنو شوێن وتەی ئەبوموسلیم خەولانی کەوتوون، کە گوتویەتی: "ئایا هاوەڵانی پێغەمبەر دروودی خودای لێ بێت پێیان وایە، تەنها خۆیان شوێنکەوتەی بن؟ نەخێر هەرگیز، سوێند بەخودا ئێمەش پێشبڕکێیان لەگەڵدا دەکەین چۆن پێش برکێیەك، هەتا بزانن، کە پیاوی مەردیان لەپاش بەجێماوە!" بەڵێ، ئەبو موسلیم ڕاست دەکات، هەر یەکێکتان دەتوانن یەکێك بێت لەو پیاوانە، کە پەیمانی گەنجانی کوڕانو کچانی ئەم نەتەوەیە تازە دەکاتەوە، بە شوێنکەوتنی ئایینو پەیامبەرە دەستپاکەکەی.

لەوانەیە بڵێن: چۆن ببین بەو نموونەیەو دەبێت چی بکەین؟

گرتنە ڕێی ئەو شاڕێیە، ئاسانو ڕوونو جوانە، دەتوانم لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا، ئاماژە بە ڕواڵەتەکانی بدەم:

- هەمیشە ئەوەتان لەبیر بێت، کە داهاتوو چارەنووسو هەموو کاروبارێکتان لە دەست خودای زۆر بەبەزەییو نەرمونیانو بەخشندەی بەهێزو زۆر میهرەباندایە، هەمیشە ئەم چەمکە لە هزرو نەستی خۆتاندا جێگیر بکەن، لە واتاکانی تێبگەن.
- هەرکات دەرفەتێکی کاری چاکەتان هاتە بەر دەست، لە دەروونتاندا بڵێن: (ئەم کارە پەروەردگارم ڕەزامەند دەکات)، پاشان پەلە بکەنو چاکەکە بکەن، بۆ نموونە: زەردەخەنەیەك بەڕووی کەسێکدا، سڵاوکردن لێی، دەستهێنان بە سەری بێباوکێکدا، خێرکردن بە پارەیەکی کەم، ماچکردنی دەستی دایكو باوك، پێشکەشکردنی خزمەتێك بە هاوڕێیەك.. هتد.
- بۆ داگیرساندنی گڕی تامەزرۆبوون لە دڵەکانداو هەستکردن بە ئاسوودەیی بەرامەکانی بەخشندەی میهرەبان، شتێکی تاکانە هەیە، ئەویش لە خەوهەڵسانە بەر لە بەرەبەیانو ڕووکردنە خودای گەورەیە بە نزاو نوێژو پاڕانەوە.. بەهیوام ئەم پەرستشە، ببێت بە بەشێك لە بەرنامەی ڕۆژانەتان، ئەوسا دەسکەوتە مەزنەکانی بەدی دەکەن، کە زۆر لایەنی ژیانتان ڕووناك دەکاتەوە، جا ئایا بەنیازن جێبەجێی بکەن؟
- فێری هونەری ملکەچکردن، خۆبەکەمزانینو خۆشکاندن بۆ خودای گەورە ببن، تەواوی ئاتاجیی خۆتان بە لێخۆشبوونو هاوکاریی ئەو دەببڕن، زۆر سوپاسو ستایشی بکەن، ئەو هونەرە بکەن بە هۆکارێك بۆ ئاسککردنەوەی دڵەکانتان.
- بەرگری بکەن لە هۆکارەکانی فریودانو هەرچییەك کە هۆشتان لا دەبات لە بیرکردنەوە لە بەخشندەییو گەورەییو دەسەڵاتی خودای گەورە. پێم وایە ئەوەی کە وتم، ئەرکێکی گران نییە لەسەر شانمان، بەڵکو دەرفەتێکە، بۆ بوژاندنەوەی ڕۆحو زیندوکردنەوەی دڵو هەستکردن بە خۆشییەکانی ژیانێکی نوێ.

مۆمی ٤٣

بۆ کوڕو کچە لاوەکانم



# ئایا دەترسیت؟

و: چیمەن لەتیف

مەبەستم ئەوەیە هەست بەسامو ترس دەکەیت، پاش ئەوەی ویستت لە ژیانتدا شتێك بگۆڕیت، بەشێوەیەك دواتر هەست بکەیت، باشتریت لەو دۆخەی ئێستات؟

ئەگەر بیرت لە گۆڕینی شتێك کردەوە، یان کارێکی نائاساییت کرد؛ سرووشتییە هەست بە ترسو دڵەڕاوکێ بکەیت، تا سەرکەشی زیاتر بێت؛ دڵەکوتێ زیاتر دەبێت، مەترسیش گەورەتر.

ترس وەك "زانستی دەروونزانی دەیبینێت" پاراستنی مرۆڤە لە هۆکاری هەڕەشەو مەترسی، تەنها لە بارودۆخێکدا نەبێت، کە ترس دەبێت بە بەربەستێك لەبەردەم هەڵکشانو بەرەو پێشچووندا، ڕێگرە لەوەی مرۆڤ کار بکاتو تێبکۆشێت، ئەم دۆخە لێرەدا نەخۆشییە پێویستی بە چارەسەرو خۆدەربازکردنە.

ئەوەی زانراوە"جێگیرە" کاتێك کەسێك دەیەوێت کار بکات بۆ گۆڕینی شتێکی ئاسایی، ڕوو بەڕووی سوپایەك لە هەستی نەرێنی "خراپ"و تێکشکێنەر دەبێتەوە، کە دەیانەوێت واز لەو ئەرکە بهێنێت. گرنگترینیان هەستکردنە بەترس، ئەوەتا یان کایەکە دەباتەوە، یاخود دڵەڕاوکێ، سامو ترس بەسەریدا زاڵ دەبێتو کایەکە دەدۆڕێنێت. کەسانی وامان تێدایە، کە ژیانی لە دەوروبەری ئاواتە: گچکەکان بەڕێ دەکات، هەمیشە ترسی لە نادیارە، زەندەقی چووە، ناوێرێت لە دەرگای نوێ بدات، دەوری خۆی گرتووە بەوەی دەیزانێتو لەسەری ڕاهاتووە، یان کەسانێکی زۆر بەر لەو تاقییان کردووەتەوە.

یان ئەوەتا کەسێکی نەبەردو ئازایە، باوەڕی وایە تەنها جارێك دەژێت، دووبارە هەلێکی بۆ هەڵناکەوێت، بە نەبەردیو بوێری دەوری نەزانراوەکان دەدات، چێژ لە تامی تاقیکردنەوە دەکات، بەڵکو چێژ لە سەرکەشیو ئابڵوقەدانیش دەبینێت.

سەرباری ئەمانە، "مارك توین" نووسەری ئەمریکی لەم بارەیەوە بە زانیارییەك ئاگادارمان دەکاتەوە، شتێکمان لەوپەڕی گرنگیدا پێ دەڵێت: ئەو کە ژیانێکی دوورودرێژ ژیا، هەمیشە دڵی پڕبوو لە سامو بیم، بەڵام ئەو ڕووداوانەی بەدرێژایی ژیان، ئەوی ترساندبوو، هیچیان ڕوویان نەدا!! ئاگادارمان دەکاتەوە زۆرێك لەو شتانەی لێیان دەترسین، هیچکات ڕوو نادەن، دەمرین هیچیان ڕووبەڕوومان نابنەوە!

دەروون هەمیشە بە وەیل ئاگادارمان دەکاتەوە، هەندێکمان هەمیشە خراپترین سیناریۆ بۆ ڕووداوەکان درووست دەکات، بەشێوەیەك کاریگەری بەسەر بڕیارەکانی ژیانیانەوە دەبێت، وایان لێ دەکات نەتوانن بڕیاری گرنگو چارەنووسساز لە ژیاندا دەربکەن.

ماوەم بدە، ڕێسایەکی گرنگت لە ڕێساکانی ژیان پێ بڵێم: سەرکەوتن بەهرە نییە، بەڵکو بەدەست دێت.

بە سادەیی تۆ ئازادیت لەوەی کەسێکی ئاسایی، یان لەسەرووی ئاساییەوە بیتو هەست بە ئەمان بکەیت، یان ئەوەتا مرۆڤێکی گەورە دەبیت، ڕووبەڕووی هەندێك ئاستەنگو ترس دەبیتەوە.

ئەوەتا ژیان لە دەوری پەنجەکانت دەگوزەرێنیت، ترسی ئەوەت هەیە ئەو ژاوەژاوەی لە دەورت ڕوو دەدات، سەرنجی دەرووبەرت ڕادەکێشێت، یاخود جەسوورانە دەنگت بڵند دەکەیتەوە، بەنەبەردیو نەترسەوە، وا دەکەیت دەورووبەرەکەت قەبووڵت بکەن.

لە کتێبە نایابەکەیدا (باوکی دەوڵەمەندو باوکی هەژار)، "ڕۆبەرت کیوساکی" دەڵێت:

گرنگترین بنەما لە توێژی نەدارانەوە بتگەیەنێت بە چینی دەستڕۆیشتووان، ئەوەیە کە لە هۆشتدا هەژاری، جۆری بیرکردنەوەی هەژارانەو شێوازی مامەڵەکردنیان لە ژیاندا واز لێ بهێنیت، لە هۆشتدا دەست بە جێگیرکردنی بیرکردنەوەو ڕەوشتی دەوڵەمەندان بکەیت، ئەوەی گرنگو پێویستە جێبەجێی بکەیت ئەوترسە تووڕ بدەیت، کە ڕێگرە لەوەی سەرکەش بیت، ئەو ترسە هەمیشەو لە گشت شتێکدا هاوبەشی خەڵکییە، ترسە وایان لێ دەکات کە ئەوشتەی هەڵی دەبژێرن، سانا بێت، ڕووبەڕووی کەمترین سەرکەشیان نەکاتەوە، لەبەرئەوە هەمیشە بەکەمترین پشك قایلن.

زۆربەی خەڵکی لە ژیاندا، ئەو ئارەزووانە دیاری دەکەن، کە کەمترین بەشی ئاواتەکانیان بۆ بەدی بهێنێت، تووشی شڵەژان دەبێت ئەگەر هەست بکات، مەترسییەك دەرگەی دەکوتێ، سەرەڕای ئەوەی لە کاتێکدا دەبێت بە سەرکەشی ئەو دەرکە بگرێتو ئابڵووقەی بدات.

ناڵێم بەدوای سەرکەشیدا بگەڕێ، یان بەدڵەکوتێ ژیان تەواو بکە، بەڵام ئاگادارت دەکەمەوە، بەر لەوەی لەپڕ تووشی شڵەژانو دڵەڕاوکێ ببیت، لەبەرئەوەی تۆ بڕیات داوە خاوەن ئاواتی گەورە بیت، داهێنەر بیت، بێگومان سەرکەشی، ترسو سام بەرەو ڕووت "هێرشت بۆ دەکەن" دێن. کەواتە: لە ئامادە باشیدابە بۆیان.

پوختە.. دەبێت دڵنیا بیت کە گۆڕانکاری زۆر ماندوت دەکات، لە هاتنی مەترسە، بەڵام خۆتی بۆ ئامادە بکە، لەبەرەی ئیشکەراندا خۆت ببینەوە، ئەنجامی ئەو بڕیارەش وەئەستۆ بگرە، ڕازی مەبە بەوەی ترس دەستو پێت ببەستێت، ئەوکات بەڕێگای کەسانی ئاساییدا ژیان بەڕێ دەکەیت.

**دڵۆپەی تیشك**

کاتێك هەوڵ دەدەینو دەترسین، گازندەکانمان ناپاکیمان لەگەڵدا دەکەن، ئەو چاکانەمان لەدەست دەدەن کە یاوەرمانن (ولیام شکسپیر).

# ئایا حەز لە کارکردن دەکەیت؟

١- ئایا هەست بە بێزاری دەکەیت، کاتێك کار ناکەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٢- ئایا ڕۆژانە کاتێکی زۆر وەرزش ئەنجام دەدەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٣- ئایا هەست دەکەیت کە پشوودانت لەلا قورسە؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٤- ئایا ڕۆژانە هەموو بەیانییەك زوو لە خەو هەڵدەستیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٥- ئایا بەیانیانی ڕۆژانی پشوو، تا کاتێکی درەنگ لە جێگەکەتدا دەمێنیتەوە بە بیانووی ئەوەی پشووە؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٦- ئایا بە دەم نانخواردنەوە کاردەکەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٧- ئایا لە بری مۆڵەتوەرگرتن، هیچ کات هەوڵت داوە کاری زیاتر بکەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٨- ئایا جگە لە کاری فەرمیت، کاری دیکە دەکەیت؟ واتە: لە یەك کاتدا دوو کار دەکەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

٩- ئایا کاتێك لە خەو هەڵدەستیت، نیگەرانی کارەکەتی؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٠- ئایا ئەندامانی خێزانەکەت، هیچ کات سکالایان کردووە لێت، لەبەرئەوەی ڕۆژانە چەندین کاتژمێر کار دەکەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

١١- ئایا زۆرجار جگە لە کاری فەرمیت، کاری زیادە دەکەیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٢- ئایا دەتەوێت لە کارەکەتدا پلەت بەرز ببێتەوە؟

١٣- ئایا نۆرە لەگەڵ هاوڕێکەت دەکەیت کاتێك نەخۆشەو ناتوانێت بە باشی کارەکەی ڕاپەڕێنێت؟ واتە هاوکاری دەکەیت لە کاتی پێوستدا؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٤- ئایا چێژ لە کارەکەت دەبینیت؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٥- ئایا بێبەرامبەر کار دەکەیت، ئەگەر زانیت، ئەو کارە زۆر پێویستە؟

أ- بەڵێ . ب- نازانم. ج- نەخێر.

تێبینی: بۆ سەرجەم خاڵەکان، وەڵامی بەڵێ (٢ خاڵ)و بۆ وەڵامی نازانم (١ خاڵ)و بۆ وەڵامی (نەخێر سفر) دابنێ، جگە لە خاڵی پێنجەم.. خاڵی پێنجەم بۆ وەڵامی بەڵێ (سفر)و بۆ وەڵامی نازانم (١ خاڵ)و بۆ وەڵامی (نەخێر ٢) دابنێ.

ئەنجام:

١- ئەگەر کۆی خاڵەکانت ٢٦- ٣٠ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کار بە پیرۆز دەزانیت.

٢- ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان ٢٢- ٢٥ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کەسێکی چالاکیت.

٣- ئەگەر کۆی خاڵەکانت ١٨- ٢١ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کەسێکی لەسەرو کەسی ئاساییەوەیت.

٤- ئەگەر کۆی خاڵەکانت ١٣- ١٧ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کەسێکی ئاساییت.

٥- ئەگەر کۆی خاڵەکانت ٩- ١٢ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کەسێکی لە خوار کەسی ئاساییەوەیت.

٦- ئەگەر کۆی خاڵەکانت ٥- ٨ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کەسێکی تەمەڵیت.

٧- ئەگەر کۆی خاڵەکانت ٠- ٤ خاڵ بوو.. ئەوا تۆ کەسێکی زۆر تەمەڵیت.





# هێزی بەخشین!

پزیشکێك کە بەرپرسی پرۆژەی خوێنبەخشین بوو، بۆ ئەو نەخۆشانەی نەخۆشیی تالاسیمیاو کەمخوێنییان هەیە، ئەم نموونەیەی بۆ بینەرو بیسەرو خوێنەرانی گێڕایەوە:

هەموان دەزانین، «دەریای مردوو»، هەروەها «دەریاچەی تەبەریە»، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدان. هەرچی ئاوی دەریای مردووە، ناڕژێتە ناو لقو چەمو جۆگەو جۆباری ترەوەو لەبەریشی ناڕواتو سەفەر ناکات.. کەچی دەریاچەی تەبەربەیە وا نییە؛ چونکە هەم لقو چەمەوەو جۆگەو جۆباری دیکەی لێ دەبێتەوە - کە بەناوبانگترینیان چەمی ئوردنە - هەم تێی دەڕژێت. ئەمەش وا دەکات، ئاوی دەریاچەکە، بەبەردەوامی نوێ ببێتەوە.. بەڵام دەریای مردوو، نەك ناڕژێتە ناو هیچ جێیەکەوە، بەڵکو تەنها لە سەرچاوەکەی خۆی، ئاو وەردەگرێت. بەو پێیەی ئاوەکەی بێخوڕەو هاژەیەو نوێ نابێتەوە؛ ئەوا ئەو خوێو لیتەو نیشتووانەی هەیەتی، بەسیەتی؛ بۆئەوەی ڕێژەکەیان تێیدا بەرز ببێتەوە، خەڵکیش ناوی «مردوو»یان بەسەردا بڕیوە، لە کاتێکدا ئەم دەریایەو ئەویش دەریاچەیە.

پاش ئەوەی بینەرو بیسەرو خوێنەران ئەم چیرۆکەیان بۆ گێڕدرایەوە، بەلێشاوو گەرموگوڕی خوێنیان بەخشی.

ئەم چیرۆکە پەیامێکی هەڵگرتووە، ئەویش:

ئەوەی ببەخشێتو دەستگیرۆیی بکات؛ نوێ دەبێتەوەو دەژێتەوە.. ئەوەشی ڕژدی بنوێنێتو دەست بگرێتەوە، دەمرێتو سەر دەنێتەوە.

# وەڵامی بەجێ

دایکێک لەگەڵ ڕۆڵەکەیدا بەنێو هەزاران خودەو کڵاوی بەجێماوی سەربازانی نیشتمانەکەیدا تێدەپەڕێتو منداڵەکە لەدایکی دەپرسێت: ئەمانە هی کێن؟

دایکەکەش لەوەڵامدا دەڵێت:

ئەمانە هی سەربازگەلێکی نەزان بوون، پارێزگاریان لە تاوانبارێک دەکرد، کە نەیدەویست کورسییەکەی بەجێ بهێڵێت!

---

کیژۆڵەیەک لە باوکی دەپرسێت: بابەگیان، چ کاتێک تۆ دڵخۆش دەبیت؟ باوک گوتی: کاتێک زەردەخەنە لەسەر لێوەکانت دەبینم. کیژۆڵەکە پرسی: بابەگیان، ئەی چ کاتێک دڵتەنگ دەبیت؟ باوکە گوتی: هەر ڕۆژێک، کە بە دەستی خاڵی، دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ.

ئەمجارەیان باوکی پرسی: کیژی گوڵم، چی دەکەیت، گەر بە دەستی خاڵی، هاتمەوە بۆ ماڵ. کیژۆڵەکە گوتی: بابەگیان، کە بەدەستی خاڵی هاتیتەوە بۆ ماڵ، خەندە دەخەمە سەر لێوانم؛ تا تۆ دڵخۆش بیت!

---

لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبیان پرسی: چ شتێک کاروباری گەلێک گەندەڵ دەکات؟ ئەویش گوتی: سێ شتو سێ شت: دانانی بچووک، لە جێی گەورە.. دانانی نەزان، لە جێی زانا.. دانانی شوێنکەوتە، لە جێی سەرکردە. جا وای بە حاڵی ئەو گەلەی: سامانەکەی لە دەستی پیسکەکانیدایە.. چەکەکانیان بەدەست ترسنۆکەکانیانەوەیە.. پیاویلکەکانیشیان، کاربەدەستیانن!

گەر مرۆڤ هەر شـتێك لەدەستت بدات، بەڵام دواتر بەوردی بۆی بگەڕێت، جارێکی دی دەیبینێتەوە!

ستێنگ بول

هاوڕێ ڕاسـتەقینەکان. ئەو کەسـانەن کە دەتوانی کاتژمێر (٤)ی بەرەبەیان، پەیوەندییان پێوە بکەیت!

مارلین- ئەکتەر

ئەو شـتەی کە ئێستا بەدەسـتت هێناوە، کەمجار تامی ئەو کاتەی هەیە، کە هەوڵی دەستکەوتنیت دەدا.

بلینی بچوك- نوسەر

مرۆڤی گەشـبین ئەو کەسەیە کە هەمیشـە گڵۆپی سەوز دەبینێت، ڕەشبینیش سوور، مرۆڤی داناش هیچ ڕەنگێك نابینێت.

ئەلبرت شفاتیزر- فەیلەسوف

گەورەترین لاوازی، بریتییە لە ترس لەوەی بە لاوازی دەربکەوێت.

جاك بین- کەشیش

ئەگەر بە درێژایی ڕۆژ، ڕووبەڕووی شتێکی سەیر نەبویتەوە، ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی گرنگ نەبووە!

جیە ئیە ویلەز- زانای فیزیکی





**خۆت بەدوور بگرە لەو کەسانەی کە لە هەوڵی سووککردنی هیواو ئاواتەکانتن.**

## کەسانی بچوك هەر خەریکی ئەو هەوڵانەن، بەڵام کەسانی هەرە مەزن وات لێدەکەن کە تۆ بتوانی مەزن بیت.

مارك تواین



بە ناوی سەرنووسەرو بەڕێوەبەرو دەستەی نووسەرانو ستافی هونەریی گۆڤاری بڕیارەوە، چەپکەگوڵی پیرۆزبایی دەکەینە دیاری برای ئازیزمان: "قەیدار ڕەحیم ڕەشید" دیزاینەری گۆڤاری بڕیار، بە بۆنەی بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە (زمانو ئەدەبی ئینگلیزی)دا، سەربەرزیو سەرفرازیی لە پەروەردگاری باڵادەست  بە ئاوات دەخوازین.



# وزەی ورە!

ئەسکەندەر ڕەحیم

لە قوتابخانەی دارینی گوندەکەدا، بۆ گەرمبوونەوەی قوتابیان، زۆپای داریان بەکار دەهێنا، لەو قوتابخانەیەشدا، منداڵێکی بچووك هەبوو، هەموو ڕۆژێك زوو دەهات بۆ قوتابخانەو زۆپاکەی گڕ دەدا؛ بۆئەوەی پۆلەکەیان گەرم دابێت. بەیانییەکیان هەر قوتابییەکان گەیشتنە نزیك قوتابخانە، دەبینن گڕ لە قوتابخانەکە بەرز دەبێتەوە. خەڵکی گوند هاتن بەرەو کارەساتەکە، پاش دامرکاندنەوەی ئاگرەکە، منداڵە بچووکەکەیان – کە بێهۆش کەوتبوو- ڕزگار کرد. هەڵبەت ئەو منداڵە، مەرگ لێی نزیکتر بوو، تا ژیان. ئیدی بردیان بۆ نزیکترین نەخۆشخانە. لەوکاتەی منداڵەکە لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکێشرابوو، بەشێکی زۆری جەستەی سووتاو بوو، نیوەئاگاو نیوەبێهۆش بوو، گوێی لە پزیشکەکە بوو، کە قسەی لەگەڵ دایکیدا دەکردو دەیگوت: هیچ چارەیەکمان لەدەست نایەت، ئەم منداڵە، هەر مەرگ چاوەڕێیەتیو باشترین چارەسەریشە بۆی؛ چونکە وێڕای زیانێکی زۆر سەروو ناوقەدییەوە، خوار ناوقەدیشی بەتەواوی سووتاوە.. بەلام منداڵەکە نەیدەویست بمرێت، بڕیاری ژیانی دا، خودا دەرووی کردەوەو لە چنگی مەرگ ڕزگاری بوو، بەجۆرێك پزیشکەکە زۆر سەرسام بوو.

ئەو کاتەشی مەترسیی مەرگهاوەری لە کۆڵ بووەوە، دیسان گوێی لە پزیشکەکە بوو، کە بە دایکی گوت: مەرگ بۆ ئەو منداڵەت باشترە، چونکە چیدی ناتوانێت بڕواتو ئاگرەکە ئێسکو گۆشتی خوار ناوقەدی سووتاندووەو تا ماوە، بە کەمئەندامی دەمێنێتەوەو ناتوانێت پەلەکانی بجووڵێنێت. جارێکی دی ئەو منداڵە بڕیاری دا، کە هەرگیز کەمئەندام نابێتو بەپێیەکانی دەڕوات.

بەلام بەداخەوە، هیچ هێزێکی ئەوتۆی نەبوو، تا بەشی خوارەوە لەشی بجووڵێنێت؛ چونکە گەرچی دوو لاقی باریکو لاوازی هەبوون، بەڵام ژیانی تێدا نەبوو. دواجار لە نەخۆشخانە دەرچوو، دایکیشی هەموو ڕۆژێك، لاقەکانیی دەشێلا، بەڵام لاقەکانی نە هەستێکیان تێدا بوو، نە دەیتوانی کۆنترۆڵیان بکات.. کەچی بڕیاری بەپێ ڕۆیشتنی، لە پێشتر بەهێزتر بوو. ئەو دەمەی لەسەر جێگە نەبوایە، لەسەر عەرەبانەی دەستی بوو.. پاشان لە ڕۆژێکی پرشنگداردا، دایکی بە عەرەبانەکە، بردی بۆ حەوشەی ماڵەکەیان؛ تا هەندێك هەوای پاك هەڵبمژێت. هەر لەو ڕۆژەدا، لە جێی ئەوەی لەسەر عەرەبانەکەی دابنیشێت، خۆی هەڵدایە سەر زەوییەکەو لەسەر گژوگیاکە، لاقەکانی بەدووی خۆیدا ڕادەکێشا، هەتا گەیشتە دیوارە نزمەکەی چواردەوری باخچەکەیان.

پاش هەوڵو ماندووبوونێکی زۆر، توانی خۆی بە دیوارە نزمەکە بەرز بکاتەوە، خۆی پێدا هەڵواسی، بەدرێژایی دیوارەکە، دەستی بەڕاکێشانی خۆی کرد، لە دڵەوە بڕوای وا بوو، گەر ئەمجارەش نەبێت، جارێکی دی بە پێیەکانی دەڕوات.

ئیدی ڕۆژانە، ئەم کارەی دەکرد، هەتا توانی بەئاسانی بە دەوری دیوارەکەدا بڕوات.

بەهۆی شێلانی ڕۆژانەشەوە، منداڵەکە توانی بەپێیەوە ڕابوەستێت، پاشان بە دارشەق دەستی بە ڕۆیشتن کرد، دواتر توانی بۆ خۆی بڕوات. ئەوجا توانی ڕاکردن ئەنجام بدات، پاش چەند ساڵێك، لە زانکۆ، تیپێکی ڕاکردنی پێك هێنا، دواجار لە یەکێك لە گۆڕەپانەکاندا، هێشتا ئەو منداڵە دەبینرێت، کە چاوەڕێی ژیانی هەر نەدەکرا، چاوەڕێی ڕۆیشتن، چجای ڕاکردنی، هەر نەدەکرا، بەڵام بە بڕیارو لێبڕان، دکتۆر: جلین کینگهام، توانی نازناوی خێراترین یاریزانی ڕاکردن لە جیهاندا بەدەست بهێنێت.

سا ئەگەر هەموو جیهان، بە ڕووتدا هاواریان کرد: ئەستەمە.. ئەوا هەر خۆت دەتوانیت، قسەکانی ئەوان بەڕاست بخەیت، یا نا.. جا نەکەیت بێئومێدی بەسەرتدا زاڵ بێت، چونکە گەر ئومێدەوار بوویت، سەرکەوتوو دەبیت.

# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

نارین جووتیار



## 7 جودیت بلگار Judit Polgár

جودیت بولگارییە، تەمەنی٤٠ ساڵە، نازناوی (گراند ماستەر)ی بۆ یاریی شەترەنج بەدەست هێناوە، ئاستی زیرەکییەکەی دەگاتە ١٧٠. زۆرن ئەوانەی شانازی بەو ناوە دەکەن کە دەیبیستن، ئەو بچووکترین پاڵەوانە، کە هەموو سنوورێکی تێپەڕاندووەو هەموو کۆتو بەندێکی شکاندووەو بووە بە هێزترین یاریزانی ئافرەت لە یاریی شەترەنج، کە بە بیروهۆشی، پارچەکانی شەترەنجی جووڵاندووەو بە دڵو بە هۆش یاریی کردووە.

**ژیانی تایبەتی:** لە ٢٣ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٦ لەدایك بووە، باوانی کۆچ دەکەن بەرەو ئیسرائیل، پاشان بۆ کەنەدا، جودیت دوای پێکهێنانی ژیانی هاوسەرێتی کۆچ دەکات بەرەو هەنگاریا، ئەو یەکێکە لەو سێ کچە بەهرەمەندانەی یاریی شەترەنج، کە گەیشتوون بە پلەی باڵا لە چەندین پاڵەوانێتیدا، گەورەکەیان "سۆزان"ـە کە جامی جیهانیی شەترەنجی بەدەست هێنا لەسەر ئاستی خانمان، ناوەنجییەکەشیان "صۆفیا" نازناوی «مامۆستای نیودەوڵەتی» پێ بەخشرا.

جودیت لە ٢٠١٤ لە چاوپێکەوتنێکیدا بۆ گۆڤاری « تایمز»ی بەریتانی بڕیاری وازهێنانی خۆی لە یاریی شەترەنج ڕاگەیاند؛ لەبەرئەوەی خێزاندارەو دایکی کچو کوڕێکە، هەروەها تا کاتی زیاتری خۆی بۆ خێزانەکەی تەرخان بکات، کە لە ٢٠١٢ پێکی هێنابوو، ئەو ئێستا لە بولگاریا نیشتەجێیەو هەڵساوە بەکردنەوەی قوتابخانەیەکی نێودەوڵەتی (أ ف ب) بۆ پێگەیاندنی ناوبژیوانو ڕاهێنەرو یاریزانی شارەزاو زیرەكو باوەڕپێکراوو بلیمەت لەو بوارە، هاوکات کتێبی زۆری نووسیوەو چەندین بەرنامەو پڕۆگرامو یاریی بیرجووڵاندنی بۆ منداڵان داناوە.

**نازناووخەڵاتەکانی:** لە تەمەنی ٩ ساڵیدا، توانیی پاڵەوانێتیی نیۆیۆرك لە ١٩٨٦ بەدەست بهێنێت، دواتر لە حەوت ڕکابەریدا سەرکەوت، لە یەکێکیاندا بەرامبەر بوو، لە تەمەنی ١١ ساڵیدا، نازناوی «مامۆستای جیهانی» بۆ شەترەنج پێ بەخشرا کە ئەو کات تەمەنی زۆر بچووکتربوو. لە کاسباروف دوای ئەوەی تەمەنی گەیشتە ١٢ ساڵ، خاڵەکانی زیاتر بوونو لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا نازناوی «گراند ماستەر»و دواتر «مۆزارت»ی پێبەخشرا. لە چەندین پاڵەوانێتیی جیهانیی تریشدا، بەشداری کردووە لە هاستینگز ١٩٩٣، مەدرید ١٩٩٤، لیون ١٩٩٦، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ١٩٩٨، غەفین ١٩٩٩، سیگمان ١٩٩٩، هەروەها لە ٢٠٠٦

ڕیزبەندیی شازدەیەمی بەدەست هێنا، لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٤و ٢٠٠٥ لە ڕیزبەندیی هەشتەمو نۆیەم بوو لەسەر ئاستی جیهانی، پلەی یەکەمی وەرگرت لەسەر ئاستی ئافرەتان، هەشت جار خەڵاتی ئۆسکاری وەرگرتووە، لە ساڵی ٢٠٠٠ پلەی یەکەمی وەرگرت لە شەتڕەنج، لە ئۆلۆمپیاتی شەتڕەنجی ساڵی ٢٠١٢ لە ئەستەمبوڵ سەرکەوتنێکی دیاری بەدەست هێنا، لە ١٠ دانیشتندا، لە پێنجیان سەرکەوتنو لە پێنجی تریش بەرامبەر بوو.

**ئەزموونی سەرکەوتنی:** پەروەردەکردنەکەی دەرەنجامی ئەزموونی باوکی «لازلۆ بولگار» کە زانای دەروونی بولگاریو نووسەری کتێبێکی پەروەردە بەناونیشانی (بلیمەت پەروەردە بکە) بووە لەبارەی پەروەردەکردنی بلیمەتەکان، بەر لە پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیری لەسەر ئەو مەبەستە لەگەڵ دایکی ڕێك کەوتوونو بەرهەمەکەی ئەو منداڵە بلیمەتە بووە.. ویستی ئەمە نیشانی هەموو جیهان بدات، کە بلیمەتی بەهرەیەکی بیرییە، دەشێ دروست بکرێت لە ڕێگەی پەروەردەوە، نەك تەنها لەڕێگەی بۆماوەوە.

هەروەها هەوڵی دا لە ناوماڵو لە تەمەنێکی زووەوە، فێری شەتڕەنجی بکات، هەربۆیە یاریی شەتڕەنج لای ئەو، وەرزشو هونەرو زانستو هەموو شتێك بووە، سەرچاوەی خۆشبەختی بووە بۆی، سەرنجو گرنگییەکی زۆری پێداوە، دەڵێت: خەونی من ئەوە بوو، یەکێکمان ببێت بە پاڵەوانی جیهانی، کە ئەوە ڕووی دا، ئیتر بڕوام وابوو کە بەختەوەر دەبم لەگەڵ دایکمو هەموو هێزی خۆمم کۆکردەوە بۆ ئەم مەبەستە، سەرەتا گومانم برد کە سەرکەوتن بەدەست دەهێنم. بەڵێ، جامی جیهانیی دەبەمەوە هەرچەندە باوکم لە ژیانا نەمابوو ڕکابەرییەکەش بەهێزبوو، بەڵام شۆڕشێکی گەورە بوو لە ژیانم، لە ٢٠٠٢ لە مۆسکۆ تا ئەوە بەدی بهێنم کە باوکم ڕەنجی بۆ کێشابوو. هەروەها دەڵێت: من کەسێکی ئاواتەخوازمو ئامانجی سەرەکیم هەوڵدانە بۆ باشتربوون، کاتێك دەگەم بە پلەیەکی بەرز، هێشتا ناتوانم بوەستم، سەختە تێبگەین ئەو بەردەوامییە لەپای چی؟! تەنها دەمەوێت یاری بکەمو خۆشی لێ ببینم، خۆشحاڵ دەبم بەو کارەی کە لێکدانەوەی ناخی منە؛ چونکە کارەکان، بە بۆچوونی کەسەکان دەگۆڕێن.. کەسانێك هەن بۆ بەدەستهێنانی سەروەت ئەو کارە دەکەنو کەسانێکی تریش هەن، تەنها بۆخۆشی بینین ئەو کارە دەکەن»!

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ شتێك مەحاڵ نییەو دەتوانرێت بەدی بهێنرێت، ئەگەر بولگار توانیبێتی، لەو ئەزموونە سەرکەوتوو بێت؛ ئەوا کارێکی ئاسان دەبێت، ئەگەر بێتو ئێمەش لەڕووی پەروەردەییەوە پەرە بە توانای منداڵەکانمان بدەین، بەمەرجێ مرۆڤ زۆر لە خۆی بکات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی، هەوڵدانی بەردەوام لەو بوارەدا، بەپێی دەرەنجام بەراورد دەکات لەنێوان کەسەکان، لەکاتێکدا بۆماوە تەنها بەشێکی کەم لە زیرەکیو لێهاتوویی مرۆڤەکان بەهرەمەند دەکات، زانایان دەڵێن: ئەوەت خۆش بوێت کە دەیکەیت؛ تا ئەوە دەکەیت کە خۆشت دەوێ، خۆشەویستیت بۆ کارو پەرۆشیو هەوڵدان دووباڵی سەرکەوتنن، دەتگەیەنن بە ئامانجە مەزنەکان.



**لە تەمەنی ٩ ساڵیدا، توانیی پاڵەوانێتیی نیۆیۆرک لە ١٩٨٦ بەدەست بهێنێت، دواتر لە حەوت ڕکابەریدا سەرکەوت، لە یەکێکیاندا بەرامبەر بوو، لە تەمەنی ١١ ساڵیدا، نازناوی «مامۆستای جیهانی» بۆ شەتڕەنج پێ بەخشرا کە ئەو کات تەمەنی زۆر بچووکتربوو. لە کاسباروف دوای ئەوەی تەمەنی گەیشتە ١٢ ساڵ، خاڵەکانی زیاتر بوونو لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا نازناوی «گراند ماستەر»و دواتر «مۆزارت»ـی پێبەخشرا**



# ساتە سەختەکان

زاهیر زانا سیدگوڵ

مــرۆڤ لەڕێڕەوی ژیانیدا، بە یەك شـێوازو ئاڕاسـتە ناڕواتو لە هەموو بوارەكانی ژیاندا، ڕووبەڕووی چەندین سـاتی سـەختو دژوار دەبێتـەوەو دەبێت ئامادەسـازیی دەروونی بۆ بكاتو تووشـی شـڵەژانو تاسانێك نەبێت، كە نەتوانێت بەردەوامی بە ژیانی بدات، دەبێت لەبیرمان بێت، كە كۆمەڵێك سـاتی سـەخت هەیە، بەسـەر هەر كەسـێكماندا دێـتو خۆ لێ لادانی ئەسـتەمە، بـەڵام دەبێت ئامادەسازبین بۆ ساتە سەختەكانو دەروونی خۆمان بەهێز بكەینو بەئاگاو وشـیاربین لەوەی كە ئەم بارودۆخانەش تێ دەپەڕێن.. وەك دەڵێـن: (بڵێ: بەو كەسـەی كـە خەفەتبارە..بـەردەوام نابێت ئەو حاڵو بارە.. چون لەدوای زسـتان، نۆرەی بەهارە... لەناو سەختیدا، سەركەوتن دیارە).

بێگومان ئێستا هەر كەسەمان ئەگەر بیرێك لە ڕابوردومان بكەینەوە چەندین سـاتی سەخت دێتەوە یادمان كەبەسـەرماندا تێپەڕیون، وەك شكسـتمان لە خوێنـدن، یان كارێكـی بازرگانی، یـان زویربوونمان لە هاوڕێیەكمـان، یـان دابڕانمـان لە كەسـوكارو خۆشەویسـتانمان، یان گرفتاربوونمان بەنەخۆشییەكی پڕ ئازار، كە ئەمانە هەمووی، گوشارێكی دەروونیمـان بۆ درووسـت دەكەنو پێویسـتە ژێری خۆمان لەدەسـت نەدەینو هۆشـیارانە مامەڵە بكەینو ئەوەی لەدەسـەڵاتی ئێمەدایە، بۆ چارەسـەر بگەڕێینو لەو شتانەشدا كە لە سەرووی ویستی خۆمانەوەیە ڕازیبیـن بەو بەشـەی پەروەردگار بـۆی دیاری كردوویـنو لەبیرمان بێت، كە درووسـتكەری بوونەوەر پێمان ڕادەگەیەنێتو دەفەرموێت: ﴿ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ الشرح: ٥ - ٦ واتـە: (بێگومـان لەگـەڵ ناخۆشیدا خۆشـی هەیەو بەدڵنیاییەوە لەگەڵ ناخۆشیدا خۆشی دێت). ناخۆشـییەكان تێدەپـەڕن، تەنهـا ئێمە پێویسـتمان بـە ورەی بەرزو خۆڕاگریو ئارامگرتنو دان بەخۆداگرتنو بەردەوامی هەیە.

ئازیـزان، ئەوەی پێویسـتە لەسـەر ئێمە، ئەوەیـە كە لەهیچ سـاتێكدا كۆنترۆڵی خۆمان لەدەست نەدەینو لەساتە سەختەكاندا نەڕووخێیـنو لـە خۆشـییەكاندا لووتبەرزو لەخۆبایـی نەبینو خۆمان لەبیرنەكەینو خەریكی كۆكردنەوەی زەخیرەبین بۆ ساتە سەختەكان، بەهاوكاریو دەستگرتنو بەشداركردنی كەسانی تر لە خۆشـییەكانماندا، تا لە ساتە سـەختەكانماندا هاوكارو پشتیوانو هـاودڵو هاوخەممان بن، با هەمیشـە لەبیرمـان بێت كە هەموو بارودۆخەكان تێ دەپەڕن وەك لەم چیرۆكەدا دیارە:

(دەوڵەمەندترین پیاوی شـار لە ئۆتۆمبێلە مۆدێل بەرزەكەی دابەزیو لەسەر دیوارێكی دیاری شار ئەو وتەیەی تۆخ كردەوە كە نووسرابوو: (ئەمەش تێدەپەڕێت)، ئەم ڕەفتارەی زۆر سەرنجڕاكێش بوو، لێیان پرسـی كە چی دەكات، وتی كاتی خۆی هەژاربووم، لای ئەم دیوارە شـتم دەفرۆشت، لەسەر دیوارەكە ئەو ڕستەیەم نووسی كە (ئەمەش تێدەپەڕێت)، ئێسـتاش هاتووم تـا تۆخی بكەمەوەو لەبیرم نەچێت، كە ئەمەش تێدەپەڕێت).

بەڕێـزان، لەسـاتە سـەختەكانو ناوجەرگـەی گرفتەكانـدا، پێویستە چەند خاڵێك بهێنینە بەرچاوی خۆمان؛ تاوەكو بتوانین زاڵ ببین بەسەر گرفتەكانداو تێیان بپەڕێنین لەوانەش:-

١. لەگەڵ ئەو هەموو ساتە سەختانەی لەڕابوردوودا بەسەرماندا هاتوون، ئێسـتاش ژیانمان بەردەوامەو تێمان پەڕانودون، بیر لەوە بكەرەوە كە هەتە، نەك لەوەی لەدەستت داوە.

٢. بزانە سەركەوتن لە كۆبوونەوەی كۆمەڵێك شكستەوە دێتو ئەو كەسـەی تووشی سەختی زۆر ببێت، لەسـەركەوتن نزیكترەو وەك دەرفەتێك بۆ ئەزموون وەرگرتن بۆ كێشەكان بڕوانە.

٣. لەگرفتـەكان ڕامەكـە؛ چونكـە تەنهـا دواخسـتنی ڕووبەڕووبوونەوەكەیـە، نەك چارەسـەر، تواناكانت بەكار بهێنەو بیـرت بێت بۆ كوژانـەوەی ئاگر، دەبێت لێی نزیك ببینەوەو پێت وا نەبێت كێشـەكان بەرەو گەورەبـوونو ئاڵۆزبوون دەڕۆن، بەڵكو گەشبین بە بەوەی نزیكن لە كۆتایی.

٤. ژیـان بـەردەوام لەگۆڕاندایەو ڕەنگە بەیانـی هەموو ئەوە بگۆڕێـت، كە تـۆی نیگەران كـردووەو ژیانی سـەخت كردوویت، هەمـوو كۆتاییەك سـەرەتایەكی تازەیە، بڕیـاری پێش وەخت، لە پێش پێشـهاتەكانەوە مەدە، ڕەنگە لەدەستدانی كارەكەت، ببێت بە هۆی دەستكەوتنی كارێكی شیاوترو باشتر.

٥. ئەگـەر ناتوانیـن كۆنترۆڵـی ژیان بكەین؛ خـۆ دەتوانین كۆنترۆڵی خۆمان لەدەست نەدەین.

بە هیوای سەركەوتنتان لە ساتە سەختەكاندا.




# لەسەرو هەموو زانایەکەوە زاناتر هەیە

هەرچەندە هەیاسی خاس یەکێکە لەو کەسانەی بە نمونەی زیرەکیو لێهاتووییو بیرتیژی دەهێنرێتەوە، خاوەنی یادگەیەکی بەهێزو بیرێکی تیژ بووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لەسەرو هەموو زانایەکەوە زاناتر هەیە، لە چیرۆکی ئەمجارەدا باس لە زیرەکی کەسێك دەکەین کە زاناو بلیمەتێکی وەکو هەیاسی خاس شایەتی لێهاتوویو زیرەکی بۆ دەدات، هەیاسی خاس خۆی دەڵێت: هەرگیز هیچ کەس نەیتوانیوە بەسەرمدا سەربکەوێت، کەس نەیتوانیوە لە وەڵامەکانم دەرباز ببێت، بەڵام ڕۆژێکیان کەسێکم توش هات، لە من زیرەکترو لێهاتوو تر بوو.. وەڵامەکەی لە پرسیارەکەی من بەهێزتر بوو.. بەشێوەیەك کە وەڵامێکم بۆ پرسیارەکانی ئەو پێنەبوو..

هەیاسی خاس لەو بارەیەوە بەمشێوەیە دەدوێت: ڕۆژێکیان لە دادگای شاری بەسرە دانیشتبووم، پیاوێك هاتە ژوورەوە بۆ لامو وتی: من هاتووم بۆئەوەی شایەتی بدەم، کە فلانە بێستان موڵکی فلانە کەسە، هەیاس لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: خۆ ئەگەر دادوەریم بکردایە لە نێوانیاندا ئەوا ئەو بێستانەم هەر دەگێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی کە فلان کەسە، بەڵام ویستم ئەم کابرایەی کە هاتووە شایەتی لەسەر ئەو بێستانە بدات تاقی بکەمەوە، ڕووم کردە کابراو وتم: ئەگەر تۆ ئەوەندە دڵنیای کەئەو بێستانە هی فلانە کەسە، کە تۆ شایەتی بۆ دەدەیت کە بێستانەکە هی ئەوە، ئایا دەتوانیت پێم بڵێی کە ئەو بێستانە چەند درەختی تیایە؟

شایەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: جەنابی قازی جەنابتان چەند ساڵە لەم دادگایەدا دادوەری دەکەن؟

هەیاسی خاس گوتی: لە وەڵامدا پیم گوت، چەند ساڵێکە لێرە دادەوەری دەکەم لە نێوان خەڵکیدا.

شایەتەکە وتی: جەنابی قازی ئایا دەتوانی پێم بڵێی: چەند دار لە بنمیچی ئەم ژووردایە کە بەڕێزتان دەمێك ساڵە تیایدا دانیشتونو ڕۆژانە چەندین کێشەی دادوەریتان لە چوارچێوەی ئەم ژووردا چارەسەر کردووە؟ ئایا ژمارەی دارەکانی بنمیچی ئەم ژوورە دەزانن؟

هەیاس دەڵێت: زانیم مەبەستی پرسیارەکەی چییە، بەڵام بەداخەوە نەمزانی وەڵامی پرسیارەکەی بدەمەوە، شایەتەکە مەبەستی ئەوەبوو کە من چەند ساڵە لەم ژووردا دانیشتووم، بەڵام نازانم ژمارەی دارەکانی بنمیچی ئەو ژوورە چەندە کە ڕۆژانە لە ژێریدا دادەنیشم! ئیتر ئەو چۆن بزانێت ژمارەی درەختەکانی ئەو بێستانە بزانێت چەندە، لە کاتێکدا بێستانەکە زۆر گەورەترو فراوانترە لە ژوورەکەی من؟!

هەیاسی خاس دەڵێت: ڕاشکاوانە پێم گوت: ببورە نەخێر نازانم ژمارەی دارەکانی بنمیچی دادگا چەندە.. ئیدی ڕێگەم دا شایەتییەکەی بداتو هەروەها شایەتیەکەیم پەسەند کرد!

ئەم بەسەر هاتەش هەمووان فێردەکات کە بە زانستو زانیارییەکانمان نەنازین، با وا نەزانین کە زانستی ئێمە لەسەرو هەموو کەسەوەیە، بە پێچەوانەوە، هەمیشە کەسی زیرەکترو بە تواناتر هەیە، ئەمڕۆ، یان سبەی تووشی دەبیت. لەبەرئەوە هیچ کات بە زانستەکەت مەنازەو لە خۆت بایی مەبە، بێگومان لەسەرو هەموو زانایەکەوە زاناتر هەیە!

ئەو منداڵە بێباوکانەی ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی!

بەشی دووەم

# پێغەمبەر موحەمەد ﷺ

بەرزان ئەبوبەکر

## گەورەترین مرۆڤ لە مێژوودا ٥٧١ - ٦٣٢ زاینی

### بانگەوازی نهێنی:-

دوای دابەزینی سوورەتی «المدثر»، بانگەوازی نهێنی دەستی پێکرد، پێغەمبەر «ﷺ» ماوەی سێ ساڵ بانگەوازی زۆر بەنهێنی دەست پێ کرد، سەرەتا لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم، لەگەڵ موسوڵمانەکاندا کۆدەبوویەوەو باسی لە گەورەییو تاکوتەنهاییو دەسەڵاتی پەروەردگار بۆ دەکردن، لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا، تەنها ٣٠ کەس موسوڵمان بوون، تا دواجار پاڵەوانی شاری مەککە، عومەری کوڕی خەتتاب، چوو بۆ خزمەتی لە ماڵی ئەرقەمو موسوڵمان بوو، پاش موسوڵمانبوونی عومەر، بانگەواز ئاشکرا کراو موسوڵمانان بە دوو ڕیز، کە پانزەی یەکەم عومەری کوڕی خەتتاب سەرکردایەتی دەکردنو پانزەی دووەمیش حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب، بە دەنگی بەرز، بەئاشکرا، بەرەو کەعبەی پیرۆز بە «الله اکبر- لا اله إلا الله» مەککەیان هەژاند. ئەمەش بوو بە سەرەتای بانگەوازی ئاشکرا.

### بانگەوازی ئاشکرا:-

هەرچەندە لەم ماوەیەدا، موسوڵمانەکان ژمارەیان زیادی کرد، بەڵام بۆ بەرەنگاربوونەوەو ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، لەلایەن دەسەڵاتدارانی مەککەوە، ئازاری زۆر دەدرانو سووکایەتیان پێ دەکرا.. سەرەتا بۆ ڕزگاربوون لەم حاڵەتە، پێغەمبەر «ﷺ» فەرمانی کرد بەشێك لە موسوڵمانان، کۆچ بۆ وڵاتی حەبەشە بکەن؛ چونکە لەوێ پادشایەکی دادپەوەری مەسیحی لێیەو ستەم لە کەس ناکاتو پشتی چەوساوەکان دەگرێت، ئەوەبوو بەشێك لە موسوڵمانان، چوون بۆ حەبەشەو لەوێ لەلایەن پاشا نەجاشییەوە پێشوازی گەرمیان لێکراو ئەمانیان پێ درا، هەرچەندە قوڕەیش ویستیان بیانگێڕنەوەو قەناعەت بە نەجاشی بکەن، کە ڕێگەیان نەدا، لە حەبەشە بمێننەوە، بەڵام هەوڵەکانیان شکستی هێنا..

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بێباوەڕانی قوڕەیش زیاتر ئازاری موسوڵمانانیان دەدا، تا وای لێ هات، ئابڵووقەی ئابووریو کۆمەڵایەتیو تەنانەت کڕینو فرۆشتنو قسەکردنو هەموو ئەوانەیان لەسەر موسوڵمانان دانا، موسوڵمانان لە شوێنێکدا، کە پێی دەگوترا: شیوی ئەبوتاڵیب ژیانیان دەگوزەراند، ئەم بارودۆخەش، ماوەی سێ ساڵی خایاند، دوای ئەوەش دووان لە خۆشەویسترینو ئەزیزترین کەسەکانی پێغەمبەر «ﷺ» کۆچی دواییان کردو بۆ هەمیشە ماڵاواییان لێکرد، ئەویش خاتوو خەدیجەی خێزانیو ئەبوتاڵیبی مامی بوو، کارەساتەکە هێندە قورسو گەورەو گران بوو، کە ئەو ساڵەی ناونا: ساڵی ماتەمینی!

پاش تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر ئابڵووقەی قوڕەیشییەکان، دواجار بە ویستی خودا، پاشان بە هەوڵی کەسانی دڵسۆز، ئابڵووقەکە کۆتایی هات، هاوکات دوای هەڵگرتنی ئابڵووقەکەش، قوڕەیشییەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ئازاری پێغەمبەرو موسوڵمانانیان دەدا، بەتایبەت دوای کۆچی دوایی ئەبوتاڵیب، لەبەرئەوە پێغەمبەر «ﷺ» بیری لە ڕێچارەیەك کردەوە؛ تا گیانی موسوڵمانان بپارێزێت، سەرەتا شاری تائیفی هەڵبژاردو بەرەو تائیف بەڕێ کەوت، ئەو کات تائیف لەلایەن سێ براوە بەڕێوە دەبرا، کاتێك پەیامبەر چاوی پێیان کەوتو مەبەستی هاتنەکەی بۆ ڕوون کردنەوە، زۆر بە توندیو ناشیرینی داواکەیان ڕەت کردەوەو پێیان گوت: بڕۆرە دەرەوە لە شارەکەمان، هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو نەفامو کۆیلەو منداڵەکانیان لێ هاندان، تا بەردبارانیان بکەنو لە شار وەدەریان بنێن، بەمەش تائیف مێژوویەکی ڕەشی بۆ خۆی تۆمار کرد، کە بەدرێژایی مێژوو باجەکەی دەدەن.

پاشان گەڕایەوە شاری مەککەو بیری لە ڕێچارەیەکی دیکە کردەوە، کات وەرزی حەج بوو، پێغەمبەر «ﷺ» لەو کاتانەدا خەڵکی بانگ دەکرد بۆ بڕواهێنان بەخودای تاکوتەنهاو وازهێنان لە بتپەرستی هاوەڵدانان بۆ خودا، ئەو کات ساڵی یازدەی پێغەمبەرایەتی بوو، پێغەمبەر «ﷺ» لە عەقەبە، گەیشت بە شەش کەس لە خەڵکی یەسریب، کە لە هۆزی خەزرەج بوون، بە مەبەستی حەجکردن هاتبوون بۆ مەککە، بانگیکردن بۆ ئیسلامو باوەڕهێنان بە خودای تاکوتەنهاو بەدەسەڵات، خەزرەجییەکەیان بانگەوازەکەکەیان قەبووڵ کردو باوەڕیان هێنا..

### عەقەبەی یەکەم:-

بۆ ساڵی دواتر.. واتە: ساڵی ١٢ پێغەمبەرایەتی، ١٢ کەس لە هەر دووتیرەی ئەوسو خەزرەج، کە پێنجیان لەو شەش کەسە بوون کە ساڵی ڕابوردوو باوەڕیان هێنابوو، لەگەڵ حەوت کەسی دیکە، کە دوانیان لە هۆزی (ئەوس) بوون، هاتنەوە بۆ مەککە، لە عەقەبە بەیعەتیان بە پێغەمبەر «ﷺ»دا، داوایان لێکرد کە کەسێك لەگەڵیاندا بنێرێت؛ تا شارەزایان بکات لە ئایینی ئیسلام، پێغەمبەر «ﷺ» موصعەبی کوڕی عومەیری نارد لەگەڵیاندا، ئەوەش ناونرا پەیمانی عەقەبەی یەکەم.

### عەقەبەی دووەم:-

ساڵی داهاتووتر.. واتە: ساڵی سیانزەهەمی پێغەمبەرایەتی، ٧٣ پیاوو دوو ئافرەت بوون، لە خەڵکی شاری یەسریب باوەڕیان هێنابوو، هاتن بۆ شاری مەککە، دووبارە لە عەقەبە لەگەڵ پێغەمبەر «ﷺ» کۆ بوونەوەو بەیعەتیان پێ دا، ئەمجارەیان بانگهێشتیان کرد بۆ شاری مەدینە، تا خۆیو موسوڵمانان بڕۆن بۆ شاری مەدینەو لە دەست ئەشکەنجەو ئازاردانی قوڕەیشییەکان ڕزگاریان ببێت، پێغەمبەر «ﷺ» داواکەی قەبووڵ کردن.

## کۆچکردن بۆ مەدینە:

سەرەتا موسوڵمانەکان، بەنهێنی کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە، دواتر پێغەمبەر «ﷺ» بە هاوڕێیەتی ئەبوبەکری صدیق، پلانیان دانا بۆ کۆچکردن بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، هەرچەندە قورەیش ویستیان ڕێگەی لێ بگرنو ڕێگە نەدەن بڕوات بۆ مەدینەو بۆ ئەو مەبەستەش ١٠ گەنجی بەهێزیان هەڵبژارد، کە هەر یەکەیان لە تیرەیەك بوون؛ تا پێش ئەوەی بڕوات، بیکوژن، بەڵام پیلانەکەیان شکستی هێناو نەیانتوانی ڕێگەی لێ بگرن.. لەبەرئەوەی پەیامبەر «ﷺ» بە فەرمانی خودا، کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە.. سەرەڕای ئەو هەموو گەڕانو بەدواداچوونەی ئەبوجەهلو سوپاکەی، کە بەشوێنیاندا ڕۆیشتن، بەڵام نەیانتوانی زیانیان پێ بگەیەنن، تەنانەت نەیانتوانی شوێن پێشیان هەڵبگرن، کۆتا هەوڵ، بڕیاریان دا هەرکەس بەمردوویی، یان بەزیندوویی بیانگێڕێتەوە بۆ مەککە، سەد حوشتری بە دیاری پێ بدەن، قورەیشییەکان لەم هەوڵەشیان شکستیان هێنا، دواجار پێغەمبەر «ﷺ»و ئەبوبەکری صدیق بەسەلامەتی گەیشتنە شاری مەدینەی پیرۆز!

## پێشوازی دانیشتووانی مەدینە:

لەلایەن دانیشتووانی شاری مەدینەوە، پێشوازییەکی بێوێنەیان لێ کرا، ئەوان بە هاتنی پەیامبەر «ﷺ» بۆ شارەکەیان، لە خۆشیدا شاگەشکەبوون، هێندە خۆشحاڵ بوون، کە نەیاندەتوانی گوزارشت لەو هەموو خۆشییە بکەن..

هەموان لە هەوڵی ئەوەدابوون، چۆن بتوانن خزمەتێك پێشکەش بکەن، خەڵکی مەدینە پەیمانیان دا بە پێغەمبەر «ﷺ» کە لە خۆشیو ناخۆشیدا لەگەڵیدا بن، بەڵێنیان دا کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، بەڵێنیان دا بیپارێزنو بە گیانی خۆیان بەرگری لێ بکەن.

د.مایکل لە کتێبی (الخالدون المئة) دەڵێت: کۆچی پێغەمبەر «ﷺ» بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، خاڵی وەرچەرخانی ژیانی پێغەمبەر «ﷺ» بوو؛ چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی لە مەککە بڕوایان پێ هێناو شوێنی کەوتن، زۆر کەم بوون، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی لە مەدینە بڕوایان پێ هێناو شوێنی کەوتن زۆر بوون. پێغەمبەر «ﷺ» توانی لە ماوەیەکی کەمدا بەهێزترینو قووڵترین کاریگەری لە دڵی خەڵکیدا دروووست بکات.

هەروەها دەڵێت: بۆ یەکەمجار لە مێژوودا پێغەمبەر «ﷺ» توانی خەڵکی نیوە دوورگەی عەرەب یەکبخاتو دڵیان پڕ بکات لە باوەڕو ڕێنموونییان بکات بۆ پەرستنی خودایەکی تاكو تەنهاو بەدەسەڵات، هەر ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی سوپای موسوڵمانان - ئەگەرچی ژمارەشیان کەم بوو - بەڵام توانییان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، گەورەترین سەرکەوتن تۆمار بکەن.

## کەسایەتی پێغەمبەر موحەممەد«ﷺ»:-

پێغەمبەر موحەممەد «ﷺ» لە هەموان بەخشندەتر بووە، لە هەموان زمانپاراوترو ڕاستگۆتر بووە، بە سرووشتی خۆی، کەسێکی نەرمونیان بووە، لە هەموان ڕێزدار تربووە، قورئانی پیرۆز شایەتی ئاکاربەرزیو ڕەوشتجوانی بۆ دەداتو دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم، هەروەها لە هەموان ئازاتربووە، لە هەموانیش لێبوردەتر بووە، لە هەموانیش بەشەرمتر بووە.

دیاری قەبووڵ کردووە، بەڵام زەکاتی قەبووڵ نەکردووەو لێشی نەخواردووە، هەرگیز لەبەرخۆی تووڕە نەبووە، بەڵکو لەبەر خودا تووڕە بووە، هەر شتێك لەسەر سفرە بووایە؛ دەیخواردو عەیبوعاری لە خواردن نەدەگرت، هەرگیز بە ڕاکشانەوەو بەپێوە خواردنی نەخواردووە، هەژاریی زۆری بینیوە، جار هەبووە سێ مانگ تێپەڕیوە، ئاگر لە ماڵەکانیدا نەکراوەتەوە، واتە: جگە لە خورماو ئاو، چێشت لە ماڵەکانیدا لێ نەنراوە، حەزی بە دانیشتن لە کۆڕو کۆمەڵی هەژاراندا کردووە، سەردانی نەخۆشی کردووەو لەگەڵ جەنازەدا دەڕۆیشتە گۆڕستان.

سوعبەتی دەکرد، بەڵام جگە لە حەق شتێکی دیکەی نەدەگوت، پێدەکەنی بەبێ قاقا، لە کاروباری ماڵەوەدا، هاوکاریی خێزانەکانی دەکرد، لەو بارەیەوە دەفەرموێت: باشترینتان باشترینتانە بۆ خێزانەکانی، من لە هەموتان باشترم بۆ خێزانەکانم.

ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێت: دە ساڵ لە خزمەتی پێغەمبەر موحەممەد «ﷺ» بووم، هەر کارێکم کردبێت، هەرگیز پێی نەوتووم بۆ ئەو کارەت کردووە.

## دەوڵەتی مەدینە:

ئیدی لێرەوە دەوڵەتی ئیسلام درووست بوو بە سەرکردایەتی پێغەمبەر «ﷺ».. لە گرنگترین کارەکانی پێغەمبەر «ﷺ»، لە ماوەی ١٠ ساڵی ژیانی لە شاری مەدینەی پیرۆز:-

### ساڵی یەکەم:-

یەکەم کار کە پێشکەشیان کرد، درووستکرنی مزگەوتێك بوو، بەناوی «قوبا»، پاشان دەستووری مەدینەی بۆ دانانو کۆتایی بەشەڕی نێوان هەر دوو تیرەی ئەوسو خەزرەج هێناو برایەتی لە نێوان کۆچکردووەکانی شاری مەککەو پشتیوانانی شاری مەدینە درووست کرد، پەیمانی لەگەڵ جوولەکەکانی شاری مەدینە بەست، کە هەموان پارێزگاری لە خاكو نیشتمانی مەدینە بکەن.. بەگشتی بنەماکانی دەوڵەتی، لە مەدینە دامەزراند، هەر لەو ساڵەدا، زەکات فەرز کرا.

### ساڵی دووەم:-

لە ساڵی دووەمدا، شەڕی گەورەی بەدریان کرد، کە تێیدا موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر سوپای قورەیشدا، هەرچەندە ژمارەی موسوڵمانان ٣١٤ کەس بوو، لە بەرامبەردا سوپای قورەیش نزیکەی ١٠٠٠ کەس بوون. جەنگەکە لە ١٧ ڕەمەزاندا ڕووی دا، قورەیشییەکان ٧٠ کەسیان لێ کوژراو ٧٠ کەسیشیان لێ بەدیل گیرا، ئیدی بەدرێژایی ئەو ساڵە، مەدینە ئارام بوو، موسوڵمانان سەرقاڵی کاروباری خۆیان بوون.

### ساڵی سێیەم:-

شەڕی ئوحود ڕووی دا، لەم جەنگەدا سوپای موسوڵمانەکان شکستیان هێناو سوپای بێباوەڕان سەرکەوتن، لەبەرئەوەی تیرهاوێژەکان فەرمانەکەی پێغەمبەر «ﷺ»یان شکاند؛ چونکە لە کاتی دەستپێکردنی شەڕدا، موسوڵمانان لە سەرکەوتندا بوون، پێغەمبەر «ﷺ» ٥٠ لە تیرهاوێژەکانی لەسەر گردەکە داناو پێی فەرموون: ئێمە سەر بکەوین، یان شکست بهێنین، ئێوە ئەم شوێنە چۆڵ نەکەن، بەڵام کاتێك بینیان سوپای بێباوەڕان شکستی هێناوە لە مەیدانو موسوڵمانان دوایان کەوتوون، گوتیان: مانەوەی ئێمە لێرەدا پێویست نییە؛ چونکە سوپاکەی ئێمە سەرکەوت، ژمارەیەکی کەمیان نەبێت هەموویان گردەکەیان چۆڵ کرد، خالیدی کوڕی وەلیدیش کە ئەو کات بێباوەڕ بوو، ئەو دەرفەتەی قۆستەوەو چووە سەرگردەکەو پشتی لە موسوڵمانان گرت، بانگی سوپای بێباوەڕانی کرد، ئەوانیش کە زانییان ئەوە خالیدە، پشتی سوپای موسوڵمانانی گرتووە، گەڕانەوەو موسوڵمانانیان ئابلووقە دا، بەوەش سوپای موسوڵمانان، شکستی هێنا!

جەلال عەبدوڵڵا حاجی



# وشتر
## زیانبەخشە، یان....؟



وشــتر گیانەوەرێکی گــەورەو بەهێزە، دەتوانێــت ماوەیەکی درێژ ببرێــت، بەرگــەی گەرمــاو تینوێتــیو کەمخۆراکیی بیابــان دەگرێت، بەئاســانی بەسەر لمدا ڕێ دەکات، بۆیە بە کەشتیی بیابان ناوی دەبەن، لە کۆندا بۆ بارهەڵگرتنو گواســتنەوەی کەلوپەل ســوودی لێوەرگیراوە، وشــتر لە توانایدایە خۆراکی زیادە، بەشــێوەی چــەوری هەڵبگرێت لە کۆپارەکانیدا، لەگەڵ بڕێکی زۆری ئاو. لە سەردەمی ئێستاشدا بەتایبەت بۆ ئەو جێگایانەی ڕێگەی شــیاوی نییەو بیابانو کەمئاوە، ســوودی لێ وەردەگیرێت، هەروەها بۆ خەڵکی ناوچە بیابانییەکان، سوودی زۆرە.

وشــتر دووجۆری هەیە، وشــتری یەك کۆپارە (dromedary) کە بەوشــتری عەرەبیش ناو دەبرێت، لەناوچەی عەرەبســتاندا زۆرە، وشــتری جووت کۆپارە (Bactrian) لە ناوەڕاستی ئاسیا (مەنگۆلیا) زۆرە، لە ئەنجامی لێکدانی ئەم دووجۆرە وشترە، جۆرە وشترێکی نوێ درووســت بوو، کە یەك کۆپارەی گەورەی هەیــە، هەروەها گەورەترو بەهێزترە لە باوانی، لەئاسیادا سوودی لێوەر دەگرن.

زانایان لەو بڕوایەدان، نزیکەی (چل ملیۆن ســاڵ) پێش ئێســتا، واتە: پێش چاخی ســەهۆڵبەندان، وشتر لە ئەمریکای باکووردا ژیاوە، بەڵام بەرەو ڕۆژئاوای کیشوەرەکە کۆچی کردووەو لە ئەلاسکاوە بەرەو ئاســیا هاتوون، ئــەو دووجۆرەیان لێ درووســت بــووە، هەرچی ئەو جۆرەیانــە، کە بچووکتر بوون بەرەو باشــووری کیشــوەرەکە کۆچیان کردووە، ڕوویان کردووەتە ئەمریکای باشــوور، ئێستا لەخێزانی وشتر، چوارجۆر لە ئەمریکای باشوور دەژین، 1-guanacos ، 2-llamas ، 3-vicunas ، 4-alpacas، لەپاش دۆزینەوەی ئەمریکای باکوور، هیچ وشترێکیان تێدا نەبینی، تا ئێستاش زانایان نازانن بۆچی وشترە ڕەسەنەکان لەناو چوون!

پــاش دۆزینــەوەی ئوســترالیا، بینیــان بەشــێکی زۆری بیابانە، بۆگەڕانو دۆزینەوەی زیاتر، پێویستیان بەهۆیەکی گواستنەوە هەبوو، وشــتر باشــترین هۆکاربوو، بــەڵام لە کیشــوەری ئوســترالیادا هیچ وشــترێکی لێ نەبوو، ناچار بیریان لە هاوردەکردنی کردەوە، لە ساڵی (١٨٤٠)دا، یەکەم کاروانی هاوردەکردنی وشــتر بۆ ئوسترالیا دەستی پێ کرد، جۆری وشترەکان یەك کۆپارە بوون، یەکەمین گرووپی دۆزینەوە، لەماوەی هەشت ڕۆژدا (٢٢٠) دووسەدو بیست میلیان بڕی، هیچ ئاویان نەدا بە وشــترەکانیان، پاشان بەرەو باشوور ڕۆیشتنو بڕی (٣٢٥) سێ ســەدو بیســتو پێنج میلیان بڕی، لە ماوەی حەڤدە ڕۆژدا، لە ڕۆژی دوازدەیەمدا تەنها یەك (جەوەنە) ئاویان دا بە وشــترەکانیان، گەشتی ساڵی (١٨٩١) لەلایەن(لیندسایو وێلز)ەوە، کە بڕی (٥١٠) پێنج سەدو دە میلــی گرتەوە، لە ماوەی (٣٤) ڕۆژدا، تەنها (چوار) گاڵۆن ئاویان دا بە وشترەکانیان.

گرنگیی وشــتر بۆ دۆزینەوەکانیان، وای کرد بیر لە درووستکردنی شــوێنێك بکەنەوە، بۆ بەخێوکردنی وشــتر، لە ســاڵی (١٨٦٦) لەلایەن (Thomas Elder) وێســتگەی (بێلتانا)ی لە باشــووری ئوســترالیا دامەزراند، ماوەی پەنجا ســاڵ، وشــتری باشــی تێدا پەروەردەکرا، بوو بەهــۆی بڵاوبوونەوەی وشــتر لــە تەواوی ئوســترالیا. تاســاڵی(١٩٠٧) هاوردەکردنی وشــتر لە (پاکستانو هند)ەوە بەردەوام بوو، بە نرخێکی هــەرزان، بەجۆرێــك لە نێوان ســاڵانی (١٨٦٦ - ١٩٠٧) نزیکەی (١٠٠٠٠-١٢٠٠٠) وشــتر هاوردە کران، بۆ مەبەستی سواریو باری، هەر کاروانێك لە نزیکەی حەفتا وشتر پێك دەهات، چوار کەسی ئەفغانی لەگەڵدا بوو، نزیکەی (٢٠ -٢٥) میلیان دەبڕی لە ڕۆژێکدا، لە ناوچە بیابانییەکاندا، نزیکەی (١٦-٢٠)تەن باریان پێ بوو، وشتری نێر نزیکەی (٦٠٠) کیلۆی هەڵدەگرت، بچووکەکانیش (٣٠٠ -٤٠٠) کیلۆیان لێ بار دەکرد، وشترەکان بەکار دەهاتن لە درووســتکردنی هێڵی تەلەگراف، گواستنەوەی پارچە بــۆڕی ئاو، بــۆ کانەکانی زێڕ، شــمەكو خۆراك بۆ کەمپو شــارەکان، گواســتنەوەی خوری لە کێڵگەوە بۆ هێڵەکانی ئاســن، وشتر تاکە هۆی گواستنەوە بوو لە ناوچە وشکەکانی ئوسترالیادا.

لــەدوای ســاڵەکانی(١٩٢٠)ەوە، بەهــۆی پێشــکەوتنی هۆیەکانــی گواســتنەوە، درووســتکردنی هێڵی ئاســنین لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا، ڕۆژەکانی سوودوەرگرتن لە وشتر بەسەرچوون، ژمارەیەکی زۆر وشتر بەرەڵا کران، بەناوچە وشــكو برینگەکانی ئوسترالیادا بڵاو بوونەوە، ئەم وشترانە لەگەڵ ژینگە نوێیەکەیان ڕاهاتبوون، ژینگەیەکی لەباربوو بۆیــان، هیچ گیانەوەرێکی دڕنــدە نەبوو، تا ژمارەیــان کەم بکاتەوە، بــەردەوام لە زیادبووندا بوون، بەجۆرێك نزیك بوونەوە لەشــارەکان، زیانیان بە کشتوکاڵ گەیاند، خەڵکی ئوسترالیاش دانیشتووانە نوێیەکەی، کە بەزۆری ئەورووپی بوون، هەروەها دانیشتووانە ڕەسەنەکەشی لەگەڵ خواردنی گۆشتو شیری وشتر ڕانەهاتوونو سوودی لێوەرناگرن، بەلای ئەوانــەوە وشــتر گیانەوەرێکی کێویو زیانبەخشــە، بــە هێلیکۆپتەر لەناوایان دەبەن بەهاوکاری ســوپا، هاوشــێوەی گیانەوەرانی تری وەك: کەروێشك، ڕێوی، بۆق، مار، گاکێویو باڵندە.

مرۆڤ بەردەوام هاوســەنگی ژینگەیــی تێك دەدات، گرنگ ئەوەیە کارەکەی خۆی جێبەجێ بکات، کێشــەکە بەجێ دەهێڵێت بۆ نەوەکانی دوای خۆی. ((وشترەکان بەشداربوون لە ئاوەدانکردنەوەی ئوسترالیادا، ئێستا نەوەکانیان لەناودەبرێن، بەبێئەوەی سوودیان لێ وەربگیرێت، دەڵێن: کێویو زیانبەخشن..!)).



# گابریل گارسیا

۱۹۲۷ — ۲۰۱٤

**گابریل گارسیا مارکێز ڕۆماننووسو ڕۆژنامەوانو نووسەری بەناوبانگو سیاسەتمەدارێکی وڵاتی کۆلۆمبیا بوو.**

گابریل گارسیا لە ۱۹۲۷/۳/٦ لە گوندی ئاراکاتاکای لە کۆلۆمبیا لە دایك بووە، خێزانی گارسیا بەهۆی هەژاریو نەدارییەوە ئەرکی بەخێوکردنو گەورەکردنی گارسیای منداڵ، بەباوەگەورەی دەسپێرن، ئەو ماوەی لەلای باپیری بوو گابرێلی منداڵ هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك گوێی لەحیکایەتو چیرۆکەکانی باوەگەورەی دەگرێو ئەو بابەتە هێندە کاریگەری لەسەر گابریل دادەنێت، کەناوبراو دواتر دەنووسێ هەست دەکەم سەرجەمی نووسراوەکانم دەربارەی ئەزموونەکانم لەباوەگەورەو ڕابردووەکانی باوو باپیرانمەوەیە.

دواتر گابریل لە هەشت ساڵیدا باوەگەورەی لەدەست دەداتو دایە گەورەشی بەهۆی پیریو پەککەوتوویی چاوەکانی لەدەست دەدات. هەر بۆیە گابرا گارسیا بۆ جارێکیتر بۆ لای خێزانەکەی دەگەڕێتەوەو بەشێوەی فەرمی دەست بەخوێندن لە قووتابخانەکان دەکات. گابریل لە خوێندنگە سەرەتاییەکەی شاری "سوکری" بەنووسینی شیعرو کێشانی کاریکاتێر ناوبانگ دەردەکاتو بەهۆی بێدەنگبوونو سەرقاڵبوون بەکارەکانی لەقووتابخانە بە «گابرێلی پیرە پیاو» دەناسرێت، ساڵی ۱۹٤۰و لە تەمەنی ۱۲ ساڵیدا کورسی خوێندن بۆ خوێندکارانی زیرەك وەردەگرێ، ڕوو لە قووتابخانەیەکی سەر بەکەنیسە لەشاری زیپاکیورای نزیك پایتەختی کۆلۆمبیا دەکات. پاش هەفتەیەك مانەوە لە قووتابخانەکە واز لە خوێندن دێنێو بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە.

سەرەتای داهێنانە ئەدەبیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹٤٦ کە ئەو کات لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو، تەمەنی ۱۹ ساڵ بوو، یەکەمجار لە ڕۆژنامەی (ئلسبیکتادور)کۆلۆمبی چیرۆکێکی بەناونیشانی (دەست لەکارکێشانەوە) بڵاوکردەوە، سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بە کەسێکی عەبقەری وەسفی کردو بە نووسینەکەی زۆر سەرسام بوو، ئەمەش بووە سەرەتای قۆناغی داهێنانو دەرکەوتنی گابریل گارسیا، دوای ئەوە ڕۆژنامەکە دەیان چیرۆکی گابریل گارسیایان بڵاوکردەوە، پاشان ڕۆژانە وتاری دەنووسی بۆ ڕۆژنامەی (یونیفیرسال)..

پاشان گابریل گارسیا پەیوەندی کرد بە زانکۆوەو لە بەشی یاسا دەستی بەخوێندن کرد، بەڵام لە ساڵی ۱۹٥۰ دووبارە دەست لە خوێندن هەڵدەگرێتو خۆی تەرخان دەکات بە خەونو ئاواتە گەورەکەیەوە کە نووسینە!

## گابریل گارسیا زێدی خۆی جێدەهێڵێت:

گابریل گارسیا ڕوو دەکاتە ئەوروپا، بەڵام ژیانێکی کوولە مەرگیو پڕ لە ناسۆری دەبێت لە ئەوروپا، تەنانەت بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ژیانی شوشەبەتاڵ کۆدەکاتەوەو دەیانفرۆشێتەوە، دواتر بڕیار دەدات بەرەو فەنزوێلا بڕوات، لە فەنزوێلا جارێکی دیکە دەست دەکاتەوە بە کاری ڕۆژنامەنووسی،

لە ساڵی ١٩٥٨ دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی بۆ کۆلۆمۆمبیا، لەگەڵ (خاتو مرسیدس) هاوسەرگیری دەکاتو دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ فەنزوێلا، بەڵام جیاوازتر لە جاران، چونکە گابرێل گارسیا بووەتە خاوەنی هاوسەرو هاوکات بووەتە باوك، پاش ماوەیەك بڕیار دەدات دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لە ڕۆژنامەی فەنزوێلا ڕابگەیەنێت، لەبەرئەوەی ڕۆژنامەکە لایەنگرو خۆشەویستی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەبووە.

دواتر گابیل گارسیا لە ئاژانسی هەواڵی کوبا دەست بەکارکردن دەکات، لەو ماوەیەدا دەبێتە کەسێکی نزیكو هاوڕێی سەرۆکی کوبا (فیدل کاسترو)، بەڵام کارکردنی گابریل گارسیا لەم ئاژانسەشدا تا سەر نابێت، بەڵکو بڕیاری وازهێنان دەدات، لەبەرئەوەی بە زۆرێك لە بیرو بۆچوونەکانی پارتی شیوعی دەسەڵاتداری وڵات ڕازی نابێت.

## دیارترین بەرهەمەکانی گابریل گارسیا:

* لە دیارترینو بەناوبانگترین بەرهەمەکانی گابریل گارسیا ڕۆمانی (سەد ساڵ لە تەنیایی)ە، کە لە ساڵی ١٩٦٧ نووسیویەتی، ئەم ڕۆمانە بە یەکێك لە شاکارە ئەدەبیەکانی ئەم ڕۆماننووسە دادەنرێتو زیاتر لە ٢٠ ملیۆن نوسخەی لێ دەفرۆشێتو بۆ چەندین زمانی زیندووی جیهان وەردەگێردرێتو چوار خەڵات بەدەست دەهێنێت، لەوانە لە ساڵی ١٩٨٢ خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەردەگرێت، تا ئێستاش بە یەکێك لە ڕۆمانە بەناوبانگەکانی جیهان دادەنرێت، هاوکات ئەم ڕۆمانە ڕێگەخۆشکەربوو بۆ ئەوەی گابریل گارسیا بە گەورە نووسەری سەدەی بیستەم دابنرێت.

* دەریاوانە خنکاوەکە، یەکێکی دیکە لە بەرهەمەکانی ئەم نوسەرە ناودارەیە، چیرۆکی دەریاوانە خنکاوەکە باس لە چیرۆکێکی ڕاستەقینەی کەشتییەکی نقومبووی کۆلۆمبی دەکات، لە ساڵی ١٩٥٥، کە لەبەر قورسی بارەکەیو زیادەڕەویکردنی لە هەڵگرتنی کێشی زیاد لە توانای کەشتییەکە، نقوم دەبێت، هاوکات حکومەتی کۆلۆمبی هەوڵدەدات ڕاستییەك بشارێتەوەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کەشتییەکەیان بە هۆی زریانەوە نقوم بووە). ئەوەش لەبەرئەوە بوو کە خەڵکی کۆلۆمبیا هەست بە ئەمان بکەن، لەبەرئەوە لە نوسینەکەی گابریل ڕازی نەبوون، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە گابرێل گارسیا هان بدات دەست بە کارێکی دیکە بکاتو وەکو پەیامنێر کار بکات. گابریل گارسیا وەکو پەیامنێر لە هەر یەك لە شارەکانی ڕۆما، پاریس، بەرشەلۆنەو نیۆرك کاری کردووە.

* ڕۆمانی سەد ساڵ لە تەنیاییو دەریاوانە خنکاوەکە، دوا بەرهەمی نابێت، بەڵکو دوابەدوای ئەم بەرهەمە سەرکەوتووانە، چەندین ڕۆمانی دیکە دەنوسێت، کە سەرجەمی ڕۆمانەکان ناوبانگی گەورەی جیهانی بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن. لەوانە (خۆشەویستی لە زەمەنی کۆلێرا، تۆفانە گەورەکەو کاتژمێری شووەو چەندان بەرهەمی تر کە وەرگێردراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی جیهان).

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ڕۆمانەکانی گابریل گارسیا باسکردن بوون لە ژیان لە ئەمریکای لاتیندا، بەڵام بیرکردنەوەی ئەم گەورە نوسەرەی جیهان بۆ مرۆڤایەتی بوو. ڕۆماننوس ویلیام کەنەدی لەسەر نوسینەکانی مارکیز دەڵێت: پێویستە هەموو کەسێك بیانخوێنێتەوە.

## هەندێك لە وەسیەتەکانی گابریل گارسیا:

- زۆرتان لێ فێربووم ئەی مرۆڤ، هەمووان دەیانەوێت لەلوتکەی چیا ژیان بکەن، بەڵام ڕازی خۆشبەختی هەڵگەڕانە بەسەر چیادا، نەك خودی لوتکەی چیاکە کە خەونی پێوە دەبینن.

- ڕەنگە ئەوە نەڵێم کەبیری لێدەکەمەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە بیر لەوە دەکەمەوە کە دەیڵێم.

- کەم دەخەومو خەو زۆر دەبینم، دەبێت ئاگامان لەوە بێت کاتێك خولەکێك چاو لێك دەنێین، واتە لەدەست چوونی «٦٠چرکە» لە ڕۆشنایی.

- دەڕۆمو ڕێدەکەم لە کاتێکدا ئەوانی تر وەستاون، بێدار دەبم کاتێك ئەوانی دیکە لەخەودان، گوێ دەگرم کاتێك ئەوانی دیکە قسە دەکەن.

- ئەی مرۆڤ زۆر لە ئێوەوە فێربووم، فێربووم کاتێك منداڵێکی ساوا بۆ یەکەم جار دەستی بۆ باوکی درێژ دەکات، ئەوا مانای ئەوەیە دیەوێت بۆ هەمیشە دەستی لەدەستی بەرنەدات.

- هەمیشە ئەوە بڵێ کە هەستی پێ دەکەیتو ئەوە بکە کە بیری لێ دەکەیتەوە.

- هەمیشە سبەینێیەك هەیە، ژیان دەرفەتمان دەداتێ تا باشتر بژین.

- هەمیشە بە هاوڕێو دۆستو نزیکانتان بڵێن: کە ئەوان چەندە بۆ ئێوە گرنگن.

## ماڵاوایی هەمیشەیی گابریل گارسیا:

گابریل گارسیا مارکیز ساڵی ١٩٩٩ تووشی نەخۆشی شێرپەنجە دەبێو تا دوایین ساتەکانی ژیانی لەژێر چاودێری پزیشکدا بوو.

دواجار نووسەری ڕۆمانی بەناوبانگی جیهانی (سەد ساڵ لە تەنیایی)، گابریل گارسیا مارکیز پاش ململانێیەکی زۆرو سەخت لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجەدا سەرەنجام بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە جیهانو لەئەدەبیات کردو جیهانی ئەدەبی هەتیوو خستەوە. گابرێل گارسیا مارکیز ئەستێرە پرشنگدارەکەی ئاسمانی ئەدەبی جیهان لە تەمەنی ٨٧ ساڵیدا ڕۆژی پێنجشەممە ١٧ای نیسانی ٢٠١٤ گیانی لەدەست دا.

مارکیز جگە لە هاوسەرەکەی میرسیدس، دوو کوڕی لەپاش جێماوە ڕۆدریگۆ، گۆنزالۆ.

سەرچاوە:

عظماء بلا مدارس

www.dengiamerika.com

http://www.thaqafaonline.com



بەشی سێیەم

# تۆ چ جۆرە باوکێکیت؟

ن: دکتۆر مستەفا ئەبوسەعد ..... و: خالید موحەممەد

**تۆ وزە کەڵەکەبووەکان خاڵی دەکەیتەوە:**

هۆکارەکانی ئەمە روونن، کاتێك رووبەرووی گوشار دەبینەوە بە هەر ڕێگەیەك بێت، تووشی شپرزەیی جەستەییمان دەکاتو ئەمەش پێویستی بە خاڵیکردنەوە هەیە.

• لەم حاڵەتەدا، بەراستی هەست بەباشی دەکەین، کاتێك بەتوندی هێرش بەرین بۆ کەسێك، جا بە وشە بێت، یان بە کردەوە.

• منداڵانیش زیاتر لە هەموو کەسێك بەدەست ئەمەوە دەناڵێنن؛ لەبەرئەوەی رشتنی جامی تووڕەیی بەسەر ئەواندا ئاسانترە، وەك لەوەی رووبەرووی هاوسەر، یان بەرێوبەری کارەکەت، یان هەرکەسێکی تر ببیتەوە، زۆر گرنگە بیر بکەیتەوە: من هەست بە شڵەژانو گوشار دەکەم! بەراستی من لە کێ تووڕەم؟

ئەو حەوانەوەیەی کە لە دەرەنجامی هێرشبردنەکەوە بۆت درووست دەبێت، زۆر کورتە؛ لەبەرئەوەی منداڵەکەت لە دەرەنجامی ئەمەدا، رێگەیەکی خراپتر دەگرێتە بەر، گەر باسەکەش بەم جۆرە بێت؛ کەواتە: پێویستە بگەرێیت بەدوای رێگەیەکی سەلامەت بۆ بەتاڵکردنەوەی جامی تووڕەییت.

**دەتوانی بارگرژیو شپرزەیی بە دوو رێگە لەناو بەریت:**

١- لەرێگەی ئەنجامدانی کارێکی بەهێزەوە، وەك بەتوندی بەفەرشداکێشانو پاککردنەوەی لە تەپوتۆز، یان ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو، یان رۆیشتنی خێرا، ئەمەش کارێکی کەمو بچووك نییە، ژیانی زۆرێك لە منداڵان رزگار کراوە لەرێگەی بەندکردنی لە ژووری نووستنەکەیدا، لە کاتێکدا باوکی هەڵچوو ماوەیەکی دوورودرێژ دەبرێت؛ بۆئەوەی ئارام ببێتەوە.

٢- لەناوبردنی بارگرژی لەرێگەی قسەکردن لەگەڵ هاورێکەتەوە، یان لەرێگەی بەئەنجامگەیاندنی چالاکییەکی دیاریکراوەوە، وەك: وەرزش، یان شێلان بۆ رزگارکردنی جەستەت لەو بارگرژییە.

• لە کۆتاییدا ئەوەی لەسەرتە، ئەوەیە: گرنگی بە خۆت بدەیت، بە هێندەی گرنگیدانت بە منداڵەکانت، لە راستیدا تۆ زیاتر خزمەتی منداڵەکانت دەکەیت، گەر رۆژانە کاتێك دیاری بکەیت بۆ گرنگیدان بە خودی خۆت (تەندرووستیت، حەوانەوەت) وەك لەوەی هەموو کاتەکانت بۆ ئەوان تەرخان بکەیت.

• بیروراکانت دەگۆرێن لەو کاتەوەی دەستت کردووە بە خوێندنەوە، ئەو کات دەبینی تەنانەت بەبێ ماندووبوونو تاقیکردنەوە، کردارت لەگەڵ منداڵەکانت زۆر ئاسانو باشتر بووە.

نهێنییەکە لە شێوازی دەربرین دایە..

**بۆچی شتی بچووکی وەك ئەمە، جیاوازی زۆر گرنگی لێ دەکەوێتەوە لە دەرەنجامدا؟**

نهێنییەکە لە شێوازی کارکردنی ژیریی مرۆڤدا خۆی دەبینێتەوە، گەر کەسێك یەك ملیۆن دینارت پێ بداتو داوات لێ بکات بۆ ماوەی دوو خولەك بیر لە مەیموونی شین نەکەیتەوە، تۆ ناتوانیت (ئێستە تاقی بکەرەوە، گەر باوەرمان پێ ناکەیت!) گەر بە منداڵمان گوت: (نەکەویتە خوارەوە لەسەر دارەکە)، ئەو کاتە ئەو بیر لە دوو شت دەکاتەوە: (نە) لەگەڵ (کەوتنە خوارەوە لەسەر دارەکە)؛ لەبەرئەوەی ئێمە ئەم وشانەمان بەکار هێنا، ئەم وێنەیەی بە ئۆتۆماتیکی درووست کرد، ئەوەی کە بیریشی لێ دەکەینەوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دووبارەی دەکەینەوە، (بیر لە قاشێك لیمۆ بکەرەوە، کە دانی پێدا دەنێیتو گازی لێ دەگریت، جا ئێستە حاڵی ناودەمتم بۆ باس بکە!) بزانە چۆن وەڵامی ئەم بیرکردنەوەیەمان داوەتەوە!! بەو شێوەیە ئەو منداڵە وا دەزانێ، یان وا بیر دەکاتەوە، کە لەدارەکە دەکەوێتە خوارەوە، بەرەو ئەوە دەروات، کە ئەوە بکات، لەبەر ئەوە باشتر وایە وشەو شێوازی ئەرێنی بەکار بهێنین، (باش خۆت بە دارەکەوە بگرە) (بیرلەوە بکەرەوە، کە ئەنجامی دەدەیت)!

دەیان هەل لە بەردەستدان؛ بۆئەوەی ئەمە بکەیت بەشێوەیەکی راست، لە بری ئەوەی بڵێیت: (لەبەردەم ئۆتۆمبێلەکانەوە مەرۆ) زۆر ئاسانترو باشترە بڵێیت: (لەسەر شۆستەکەو لە نزیکمەوە برۆ) بەم شێوەیەش، منداڵ دەزانێت (دەبێ چی بکات)، نەك ئەوەی کە (نابێ بیکات).

# بوێر بە

سایە سەرگەتی

سەرت هەڵبڕە، دەزانم یەکەم ڕۆژ سەختترینە، یەکەم هەنگاو، یەکەم بوێری، یەکەم کار، یەکەم لەخۆبوردنە. دەزانم هیچ کات وا بیرت نەدەکردەوە، دوای زانکۆ، ببیت بە دەستگێڕ، دەزانم هێشتا دیزاینی جلەکانی زانکۆت تێك نەچووە، هێشتا خۆبەگرنگ زانینو شەرمت بێسنوورە، دەزانم لەناخی دڵەوە ناتوانیت، بەڵام بڕوا بکە هەردەبێت بتوانیت، ئێمە پێویستمان بە پارەیە، لەبیری بکە، کاتێك هاوڕێکانت دەبینیت، چەند شەرمەزار دەبیت، هەرئێستە بیر بکەرەوە، تۆ دەبێت شتێکی باش بفرۆشیت، سبەی زوو لەخەو هەستە، هیوادارم شوێنێکی باش لە بازاڕ بدۆزیتەوە، کەلوپەلەکانتی لێ دابنێیتو نزای زیادکردنی ڕۆزی بخوێنە.

سەرت بڵند بکە، هیچ کارێك شەرم نییە، تۆ کە هەموو سنوورەکانی ڕەوشتت پاراستووە، کاتێك ڕێگە نادەیت چاوەکانت شکۆی هیچ خاتوونێك بشکێنێت، هیچ شتێك جێگەی شەرم نییە.

ڕۆژەکە تەواو بوو، دەبینی هیچت نەفرۆشتووە، هەردەمزانی، من لەهیچ شتێکدا باش نەبووم. نا، وا مەڵێ، ئەمە یەکەم سەرکەوتنە، بوێری یەکەم هەنگاوی سەرکەوتنە، بەردەوام بە، تۆ دەتوانیت ببیت بە فرۆشیارێك، کە جێگەی ڕێزی بازاڕو متمانەی خەڵکی بیت، دەتوانیت سامانێك کۆ بکەیتەوە، کە هیچ کات بیرت لێ نەکردووەتەوە، بەڵام هەمیشە لەبیرت بێت، پلانی سەرنجڕاکێش دابنێ بۆ کار، بۆ فرۆشتن. بوەستە، سبەی کە چوویتە دەرەوە، کتێبەکەت بیر نەچێت، نەك وەك ئەمڕۆ هیچ شتێك نەفرۆشیت، جار جار بیخوێنەرەوە، با دوو وشە فێر ببیت، لەبیرت بێت، تەنانەت ئەگەر ببیت بە خاوەنی زۆرترین سامان، هێشتا پێویستت بە زانستە، دەزانیت، ئێمە لە وڵاتێکداین، ئەوەی زانستی هەیە، پارەی نییە، ئەوەشی پارەی هەیە، زانستی نییە، تۆ هەوڵ بدەو هەردووکیان بەدەست بهێنە، ئێمە پێویستمان بە هەردووکیانە؛ تا ببینە خاوەنی بڕیار.

خەم مەخۆ؛ قەیرانەکان کۆتایی دێت، من وا بیر دەکەمەوە، هەر وڵاتێك خەڵکەکەی ڕۆشنبیر بێت، قەیران، باشترین هۆکارە بۆ داهێنان؛ چونکە هەموان، بیر لەجۆری تازەی کارکردن دەکەنەوە، نەك وەستان. مەبەستم ئەوەیە تۆ دەتوانیت، هەستی قەیران لە خۆتدا تووشی شێرپەنجە بکەیت، دواتر وازی لێ بهێنە، ئاگادار بە دەرمانی نەکەیت، خۆی دەمرێت، شێرپەنجەی قەیرانەکانی ئێمە، هیواو نزایە، بەردەوام بەکاریان بهێنە. ئێستەش سەیری شتەکانت بکە، چەند دانەت فرۆشتووە، دە دانە، دە کیلۆ، دە دەرزەن، نا، هەزارانت فرۆشتووە، دەبینی، هەوڵەکانت، سنووری قەیرانیان شکاند.

ئێستە کە دەڵێیت: چێژ لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا دەبینم، دەڵێی کارەکەمم خۆش دەوێت، بیر لە یەکەم ڕۆژت بکەرەوە، پێنج ساڵ پێش ئێستە، ئەو کات هەموان لە گەرمەی قەیراندا بووین، تۆ شەرمت دەکرد لە هاوڕێکانت، بوێری کارکردنت نەبوو، دەزانی ئەو هاوڕێیانەی کە شەرمت لێ دەکردن، ئێستەش تا نیوەڕۆ دەخەون، ئەوەنە ڕاهاتوون بە شکست، هەستی سەرکەوتنیان بیر چووەتەوە. دەبینی بوێرییەکەت چ موعجیزەیەکی لێ دەرچووە، دەزانیت ئەو هەستەی، کە لەوپەڕی شکستدا، بەدوای باشترینەوەیە، لە هەموو کەسێکدا هەیە، ئەی کەواتە: بۆ خەڵکی ناتوانن، یەکەمو باشترین بن؟ بەڕێزم، زۆر سادەو بێگومان؛ چونکە چاویان لە خەڵکییەو بوێر نین.



# نیگارکێشی بەخشندە

نیگار کێشێکی بەتەمەنی دەستڕەنگین لە گوندێکدا دەژیا، وێنەی زۆر جوانی دەکێشاو بە پارەیەکی باش دەیفرۆشتنەوە، ڕۆژێـك لە ڕۆژان هەژارێك کە لـە هەمان گوند دەژیا، هات بـۆ لای و پێی گوت: تـۆ بەهۆی فرۆشـتنەوەی نیگارەکانت پارەیەکی زۆرت دەست دەکەوێت، بۆچی یارمەتیی هەژارانی هاوگوندەکەی خۆت نادەیت؟ سـەیری گۆشتفرۆشـەکە بکە، هەرچەند کەسێکی دەوڵەمەند نییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ڕۆژێك گۆشـت بەسەر هەژارانی گوندەکەمان دابەش دەکات، نیگار کێشـەکە زەردەخەنەیەکی کردو هیچی نەگوت، پیاوە هەژارەکە بەتووڕەییەوە نیگارکێشـەکەی بەجێ هێشتو لە گوندەکەدا پڕوپاگەندەی ئەوەی کرد، نیگار کێشەکە پیاوێکی دەوڵەمەنـدەو لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕەزیلـەو یارمەتیی هیچ کەسـێکی هەژار نادات، خەڵکەکـەش نەفرەتیان لێ دەکردو لۆمەیان دەکرد.

پاش ماوەیەك کابـرای نیگارکێش نەخۆش کەوت، هیچ کەسێك گرنگی پێ نەدەداو تەنانەت ئامادە نەبوون سەردانیشی بکـەن، هەر بەتەنیابـوو، تا مرد.. چەندیـن ڕۆژ تێپەڕیو خەڵکی گوندەکە تێبینی ئەوەیان کرد، گۆشتفرۆشـەکە وەك جاران گۆشتیان بۆ نانێرێت، کاتێك پرسیاریان لە هۆکارەکەی کرد، گوتی: نیگارکێشـە بەتەمەنەکە هەموو مانگێك بڕێك پارەی بۆ دەناردم؛ بۆئەوەی گۆشت بەخۆڕایی بنێرم بۆ ماڵە هەژارەکان، ئەو مردو کارە خێرەکەشی وەستا!

خەڵکی گوندەکە تووشـی شـۆك بوون، ئینجا زانییان چ سـتەمێکیان لە کابرای نیگارکێش کـردووە، بەتایبەتی ئەو کاتەی کـە نەخۆش بوو، ئەمـان تەنانەت ئامـادە نەبوون سەردانێکیشـی بکەن، بەهۆی نەزانیو بڕیاردانێکی هەڵەوە، بەهۆی پڕوپاگەندەیەکی بێبنەماوە!

هەندێـك کـەس گومانـی خـراپ دەبـەن، وەهەندێکی تریـش گومانی باش، بـەڵام هەموو ئەمانە، نە سـوود، نە زیان ناگەیەنن گرنگ خودی ڕاسـتەقینەی کەسەکەو ئەوەی خودای گەورە لەبارەی دەیزانێت.

مەبەسـت لەم چیرۆکە ئەوەیە بڕیارمەدە بەسەرکەسدا بەهـۆی ئەوەی تۆ لێی دەبینی، لەوانەیە چەندین شـتی تر هەبێـت، لە ژیانیدا تۆ لێی بەئاگا نەبیت، ئەگەر بیانزانیت، لە بڕیارەکەت پەشیمان دەبیتەوە.

سەرچاوە topstories لە instagram

و. بێگەرد فارس





و: كارزان محمود

# دایكی من لەدایكی تۆ دەوڵەمەندترە!

منداڵێكی دایكو باوك دەوڵەمەند، لەقوتابخانە لەگەڵ هاوڕێ هەژارە كەیدا، كەوتە گفتووگۆو بەهاوڕێكەی گوت: دایكم خزمەتكارێكی نوێی بۆگرتووین، تاچاودێریمان بكات، كاتێك دایكم لەسەر كارەو لەماڵ نییە... دایكم تازەبەتازە چێشتلێنەرێكی نوێی بۆ بەكرێ گرتووین؛ بۆئەوەی خۆشترینو بەتامترین خواردنمان بۆ ئامادە بكات.. لەبەرئەوە دایكی من، لەدایكی تۆ دەوڵەمەندترە! دایكم پەرستارێكی بۆ گرتووین؛ تا كاتێك نەخۆش دەكەوین، چاودێریمان بكاتو ئاگاداری تەندرووستیمان بێت.. دیسانەوە بۆیە دایكی من، لە دایكی تۆ دەوڵەمەندترە! دایكم مامۆستایەكی نوێی بۆ گرتووین؛ تا ئەو وانانەی كە فێری نەبووین، بۆمانی شیكار بكاتو تێمان بگەیەنێت.. كەواتە: دایكی من، لە دایكی تۆ دەوڵەمەندترە!

منداڵە هەژارەكەش لە وەڵامی هاوڕێكەیدا گوتی: دایكی من بەدەستە ڕەنگینەكانی خۆی، باشترین خۆشترینو بەتامترین خواردنمان بۆ درووست دەكاتو ئامادەی دەكات.. هەر خۆشی چاودێریو ئاگاداریمان دەكات، كاتێك نەخۆشو بێزار دەبین، خۆی پێداچوونەوەی وانەكانی قوتابخانەمان پێ دەكات.. خۆشەویستییەكەی ئەوپەڕی دەوڵەمەندییە بۆمانو بەسمانە.. دایكی من.. ئەو خواردنەی لەئێمە زیاد دەبێت، دەیخوات، دوای ئەوەی دەزانێت كەئێمە تێربووین! نانی تازە دەداتە ئێمەو خۆی نانی كۆن دەخوات! كاتێكیش كە نەخۆش دەكەوین، خۆی چارەمان دەكات.. خۆی بەرگی كۆنە دەپۆشێت.. بەڵام بەرگی نوێ بۆ ئێمە دەكڕێت! كەواتە: ببوورە هاوڕێم دایكی من، لە دایكی تۆ دەوڵەمەندترە!

**خواطر وحكم وعبر / احمد الشقيرى**



# تا کۆتایی ئارام بگرە، ڕەنگە دواساتی چاوەڕوانی موعجیزە درووست بکات

و.لە فارسییەوە: زریان محمود

ژاڵەو مەنسوور هەشت ساڵی تەمەنی منداڵییان پێکەوە بەسەر بردبوو. ئەوان دراوسێی دیواربەدیواری یەکتری بوون، بەڵام بەهۆی مایەپووچبوونی باوکی ژاڵەوە، ماڵی ژاڵە لەو شارە نەمانو باوکی بۆ دانەوەی قەرزەکانی، خانووەکانی فرۆشتو گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان.

دوای ڕۆیشتنی ماڵی ژاڵە، مەنسوور زۆر بێتاقەت بوو، ئاخر ئەو باشترین هاوڕێی یاریکردنی لەدەست دابوو.

چەند ساڵێك بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕی کرد، مەنسوور لە کۆلێژی یاسا وەرگیرا.

دووسێ ڕۆژ بوو، کە بارانێکی زۆر دەباری. مەنسوور لە کەناری پەنجەرەکەدا وەستابوو، سەیری ئەو قوتابییانەی دەکرد، کە لەبەر بارانەکە بەخێرایی دەهاتن، بۆ لای دەرگای هاتنە ژوورەوەی زانکۆ. مەنسوور کە هەر بەردەوام بوو لەسەیرکردن لە ناکاودا وشك بوو. باوەڕی نەدەکرد، تۆ بڵێی ئەوە ژاڵە بێت، کە دەهاتە ناو زانکۆوە.

مەنسوور بەخێرایی خۆی گەیاندە لای دەرگای هاتنە ژوورەوەی زانکۆو سڵاوی لە ژاڵە کرد، پێش ئەوەی بە تەواوی بێتە ژوورەوە.

ژاڵە بەدەنگی بەرز گوتی: ئەی خودایە گیان، مەنسوور ئەوە تۆی؟!

دوای ماوەیەك بێدەنگی، مەنسوور گوتی: تازە وەرگیراویت؟!

ژاڵە بە ئاماژەی بەڵێ، سەری ڕاوەشاند.

مەنسوورو ژاڵە دوای چەند ساڵێك، چەند خولەکێکیان پێکەوە بەسەر بردو قسەیان کرد، ئەوەش کۆنە درەختی هاوڕێیەتییانی ژیاندەوە.

لەو ڕۆژە بەدواوە، ژاڵە لە کۆلێژەکەی مەنسوور دەیخوێند، جاروبار لەگەڵ مەنسوور یەکتریان دەبینیو بە دیداری یەکدی، خەمەکانیان دەڕەوییەوە، ساتەکانی منداڵییان بەبیر دەهاتەوە، لە ناخەوە حەزیان دەکرد، دووبارەو لە گەورەبووندا لە یەکتر نزیك ببنەوە، هاوشێوەی منداڵی، بەڵام ئەم جارە لە دووماڵدا نا، بەڵکو لەژێر سێبەری ماڵێکی خنجیلانەدا..

مەنسوور وردە وردە لە ڕۆژەکانی کۆتایی زانکۆ نزیك دەبوویەوە، لەبەر ئەمەش زۆر ناڕەحەت بوو؛ چونکە ئیتر نەیدەتوانی وەکو جاران، ژاڵە ببینێت. لەبەرئەوە هەر کە زانکۆی تەواو کرد، پێشنیاری هاوسەرگیری دا بە ژاڵە. ژاڵەش بەبێ چەندوچوون داواکەی قەبووڵ کرد. لە ماوەی پێنج

مانگدا هەموو ئامادەســازییەك بۆ مەراسیمی هاوسەرگیری تەواو بوو، ڕۆیشتنە ناو قەفەسی زێڕینی هاوسەرێتییەوە.

ژیانێکــی خەونئاســایان هەبــوو، ژیانێــك کــە هەموو دەوروبەریان حەســرەتیان بۆ دەخواســت. پارە، ئۆتۆمبێلی ئاخریــن مۆدێــل، ماڵی جوان، کاری بــاش، ڕەفتاری جوانو لێکتێگەیشــتنو لە هەمووشــی گرنگتر عیشقێکی گەورە، کە ماڵی ئەم دوو هاوسەرە خۆشبەختەی گەرمتر دەکرد.

بەڵام خۆشبەختیی ئەم دوو هاوسەرەی زۆری نەخایاند، لــە ڕۆژێکــی گەرمی هاوینــدا، ژاڵــە تایەکــی زۆر توندی گرت. مەنســوور، ژاڵەی بۆ چەندین نەخۆشــخانەی جیاواز برد، بەڵام هەموو پزیشــکەکان لە ئاســت چارەسەرکردنیدا دەستەوسان بوون. ئاخر نەخۆشییەکەی ژاڵە، زۆر نامۆ بوو. دوای ماوەیەك تایەکەی ژاڵە تەواوبوو ڕۆیشت، بەڵام لەگەڵ خۆیدا زمانو چاوەکانی ژاڵەی بردو ژاڵەی کوێرو لاڵ کرد...

مەنســوور چەندجــار ژاڵــەی بــردە دەرەوەی وڵات، بە مەبەستی چارەسەر، بەڵام هەر بێ ئەنجام بوو.

دوای ئەو ڕووداوە، مەنســوور هەوڵــی دەدا هەموو کاتی پشــوو، بێکارییەکانــی تایبەت بــکات بە ژاڵــەوە. چەندین کاتژمێــر کتێبی بۆ دەخوێندەوە، قســەی بۆ دەکرد لەبارەی ئایندەی گەشو ئەو کاتەی کە دەبێتە دایك.

بــەڵام دوای چەنــد مانگێك ڕەفتاری مەنســوور گۆڕراو تاقەتــی ئەو ژیانە بێدەنگو کوێرەی نەما، لەبەرئەوە وردە وردە بیری تەڵاقدانی ژاڵە لە مێشکیدا چەکەرەی دەکرد!!!

سەرەتا مەنسوور بەرهەڵستی ئەم بیرکردنەوەیەی کرد، بەڵام دوای ماوەیەك خۆی دا بەدەستەوەو بڕیاری دا، کە ژاڵە تەڵاق بدات. هەڵبەتە لەم نێوانەدا، لە هاندانی مەنسوور بۆ تەڵاقدانی ژاڵە، دایكو خوشــکەکانی مەنســووریش ڕۆڵێکی زۆریان هەبوو.

ئیتر مەنســوور گرنگی بە ژاڵە نەدەداو دوای هاتنەوەی لە کار ڕاســتەوخۆ دەچوو بۆ ژوورەکەی. تەنانەت جاری وا هەبوو، دوو هەتا سێ ڕۆژ، لەگەڵ ژاڵەدا قسەی نەدەکرد!

شەوێکیان کە مەنسوورو ژاڵە خەریکی نانخواردن بوون، مەنسور دوای ئەملاو ئەولاو پێشەکییەك گوتی:

ژاڵە من دەمەوێت شتێکت پێ بڵێم.

ژاڵە دەســتی لە خــواردن هەڵگرتو چــاوەڕوان بوو، کە مەنسوور قسەکەی بکات...

مەنســوور گوتی: مــن ئیتر نامەوێت درێــژە بەم ژیانە بدەم، واتە: باشتر وایە بڵێم: ئیتر ناتوانم. دەمەوێت تەڵاقت بدەمو مارەییەکەت...

لەم کاتەدا ژاڵە پەنجەی بە نیشانەی سکوت خستە سەر لێوی و بە ئاماژەی سەر پێشنیازی تەڵاقەکەی قەبووڵ کرد.

دوای چەنــد ڕۆژێــك ژاڵــەو مەنســوور بەمەبەســتی جیابوونەوە لە یەکتری، لەو دادگایە بوون کە ماوەیەکی کەم لەوەو پێش، هەر لەوێ بوون بە حەڵاڵو مەحرەمی یەکتری.

مەنســوورو ژاڵــە لــە دادگا هاتنــە دەرەوەو لــە ڕووی یاساییەوە لە یەکتری جیابوونەوە.

هەرلەوێ مەنسوور پاڵی دا بەدرەختێکەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشــا. کاتێك ژاڵە دەیویست بڕوات، لێی ڕۆیشتە پێشەوەو داوای لێکرد کە هەتا ماڵی دایکی بیگەیەنێت.

بەڵام بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ژاڵە گوتی: پێویست ناکات خۆم دەڕۆم.

دواتر گاڵۆکی نابینایی فڕێداو ڕۆیشت.

مەنسوور بە حەپەساوییەوە، هەر سەیری ژاڵەی دەکرد.

ژاڵە هەم قسەی دەکردو هەم دەیبینی.

مەنســوور سەری لێ شێوابوو، نەیدەزانی کە بۆچی ژاڵە ئەم یارییەی لەگەڵــدا کردووە. بەدەنگی بەرز هاواری کردو گوتی:خۆ من عاشقت بووم، بۆچی یاریت لەگەڵدا کردم؟!

مەنســوور بەتووڕەییــەوە ســواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو، ڕۆیشت بۆ لای پزیشکەکەی ژاڵە.

کاتێك گەیشتە کلینکەکەی، ڕاستەوخۆ ڕۆیشتە ژوورەوەو یەخەی پزیشکەکەی گرتو گوتی:

پیاوی ناپاك، من چ زیانێکم بە تۆ گەیاندبوو؟

پزیشکەکە لە کاتێکدا کە هەوڵی دەدا دەستی مەنسوور بە یەخەکەیەوە لاببات، داوای لە مەنســوور کرد، کەمێك ئارام ببێتەوە. دوای ئەوەی کە مەنسوور ئارام بووەوە، پزیشکەکە داوای لە مەنسوور کرد. کە بۆی باس بکات.

کاتێــك مەنســوور هەمــوو بەســەرهاتی جیابوونەوەی لەگەڵ ژاڵەدا گێڕایەوە، پزیشکەکە سەری پەژارەی ڕاوەشاندو گوتی: هاوســەرەکەی تۆ بەڕاســتی کوێرو لاڵ بووبوو. بەڵام مانگێك لەمەو پێش وردە وردە خەریك بوو توانای بیناییو قســەکردنی بەدەســت دەهێنایەوە. ســێ ڕۆژ پێش ئێســتا، بەتەواوی چاکبوویەوەو وەکوو پێشــتری لێهاتەوە. هەر بەو شــێوەیەی کە ئێمە، بۆ نەخۆشییەکەی هیچ قسەیەکمان پێ نەبوو، بۆ چاکبوونەوەشــی دیسانەوە هیچ قسەیەکمان نییە. چاکبوونەوەی ئەو موعجیزەیەك بوو.

مەنســوور پەڕییە ناو قســەی پزیشکەکەوەو گوتی: ئەی بۆچی هیچی بە من نەگوت؟

پزیشکەکە گوتی: ئەو دەیویست ساڵڕۆژی لەدایکبوونەکەت ئەو هەواڵە خۆشەت پێ بڵێت.

مەنسوور دەستەکانی گرتن بە ڕوخسارییەوەو بەبێدەنگی دەســتی کرد بە ئەشك ڕژاندن، ئاخر ڕۆژی دواتر، ساڵڕۆژی لەدایکبوونەکەی بوو...

لەبەر خۆیەوە گوتی... خۆزگە تا کۆتایی ئارامم بگرتایە، بەدڵنیاییەوە بە ئەنجامی باش دەگەیشتم، ئەوەتا کۆتا ساتی چاوەڕوانی موعجیزەی کرد...



ئیسماعیل حەمە



جەلیلی موحەممەدیان



# مرۆڤێك لێوانلێو لە نەزاهەتو مەردایەتی

جەلیل مەلا ئەحمەد ناسراو بە (جەلیلی موحەممەدیان) لە ساڵی ١٩٦٦ لە ئاوایی (واوان) نزیك لە شاری سەردەشت لە خۆرهەڵاتی کوردستان، لە باوەشی خێزانێکی زەحمەتکێشو ئایینپەروەر، چاوی گەشی بەم دونیایە هەڵێناوە، تاقانەییو کۆچی زوووادەی باوکیو ئەرکی ژیانی پڕسوێی خێزانەکەی، هەر زوو بەهاری ژیانی قاقڕ دەکەنو لە نیوەڕێی سەوادخوازیدا، بڕستی لێ دەبڕنو دەبن بە ڕێگر لە تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندنیدا.

دواتر لە تەمەنێکی فەریکیدا، شانی مەردایەتی دەداتە بەر زەحمەتو ناڕەحەتییەکانی ژیانو سەربەرزانە بۆ ژیان وەڕێ دەکەوێ، لە نێو شریتی ژیانیشی، زۆر بێدەنگانە موعجیزە دەخوڵقێنێت، دواتر لە ئێوارەی ڕۆژی (٢٠١٥/١٢/٢٧) لە ڕێگای نێوان تەورێز ڕەزایە، لە کارەساتێکی نەخوازراوی ئۆتۆمۆبێلدا هاوڕێ لەگەڵ دۆستێکی خۆشەویستی، بەناوی (حوسێن سەلیم ڕەسوڵ) دانیشتووی ڕانیە لە کوردستانی باشوور گیان لەدەست دەدەن.

ئەمما ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشاو هانی دام لەو چەند پەیڤەدا شتێك بڵێم، نە جوانی ڕووکاری، نە زمانپاراوی، نە بڕوانامەو، نەقەدو قیافەی نییە، بەڵکو کۆمەڵێك ڕەفتارو هەڵوێستی هێندە هەستبزوێنو خەندەئامێزن، کەلەم ڕۆژگاری خۆپەرستیو بوودەڵەییەدا، دەگمەنەو جێی لەسەر وەستانە!!

جەلیلی موحەممەدیان میراتێکی هێندە گەورەی لە مرۆڤدۆستی جێهێشتووە، لەنێو دۆستو ناسیاوانی سنووری

هەردوو شاری سەردەشتو پیرانشار، بگرە ئەولاتریش، نیشتیمانی پیاوەتی ئەو خۆی پێ نەگیراوەو لە نێو هاوڕێیانو خزمانی باشووریش، وەك مانگی چواردە، بە ئاسمانەوە درەوشاوەتەوەو پەنجەی بۆ ڕاکێشراوە!

پیاوێکی هێندە بزە لەسەر لێو، لێوانلێو لە هیوا، پڕاوپڕ لە مشوور، لە پیاوەتی، بالاَ ئالاَ! چونکە زۆر ڕقی لە گرگنیو قەزەمی بوو، نێوانی لەگەڵ بوودەڵەییو چرووکی خۆش نەبوو، بە بینینی نەشئە دەیگرتیو هەڵدەبڕایەوەو بالاَت دەکرد، بیزانیایە نیگەرانی خۆی لە گێلی نەدەداو نەدەبوو بەکەڕەی شەربەت، وەك دەروونناسێك دەستی دەگرتیو پیاسەیەکی پیادە، یاخود بەسواری ئۆتۆمبێلە موتەوازیعەکەی شوێنێکی دلگیر بگرەو هاتم!!

لە دیوەخانەکەشی کاتو زەمانی بۆ نەبوو، میوانداری ئیبراهیمیانە بوو، ئەم کەڵەمەردە، لە کاتی سەرقاڵیشدا زەنگت بۆ لێدابا، بۆ هەر کارێك، یان کێشەیەك، هەرگیز نەبووەو نەیگوتووە کارم هەیە، بەگیرفانپڕیو بە باخەڵخاڵی، نەبووەو نەمبینیوە بڵێ نییە، ئایینەو پاشەڕۆژو لەسەریەکدانان لای ئەو بوونی نەبوو، لە یارمەتیو دەستبارگرتنی خەڵکی نزیکو دوور، صاڵحو تاڵح، کوردو عەجەم، بە شەو، بە ڕۆژ، وەختی کارو کاتی پشوو، نەخێرو نا، لای ئەو نەبوو، لە ڕێ، لە خیابان، هێندەی گەورە سڵاویان لێ دەکرد زۆر پتر منداڵان، کاك جەلیل کاك جەلیلیان بوو! هێندەی پیاوە سادەکان ماچیان دەکرد، بارتەقا زیاتر وەزیفەدارەکان دەستیان بۆ بەسینگەوە دەگرت!

ئەم زاتە ناوازەیە لە ساتەوەختی کۆڕەوەکەدا، دەیان ماڵی کوردی باشووری گرتە ئەستۆو هەموانی حەواندەوە! جێگەی سەرنجە، لە ئێوارەیەکی درەنگوەختدا لە خزمەت دکتۆر عەبدولقادری مامۆستای گوند، بەدەم نانخواردن لەگەڵ فەقێکانیدا، فەرمووی ئەم گوندە یەکسانە بەکاك جەلیل، وا چاکە لە جیاتی (واوان) بگوترێت جەلیلئاوا!!

ئەم پیاوە دەگمەنە، خاکیش شانازی پێوە دەکرد، هەر خەریکی سەوزکردنو چاندن بوو، بۆ خەڵك بۆ خوێش، بۆ خوشکانی، لە هەڵچنینی حەوزی گوندیش سوپەرمان بوو!

زۆر لەشسووك بوو، وەك هەڵووك، وەك بروسك، قاچێك لە گوند بۆ ژیانکردن، حەوت هەنگاویش نزیك لە بیمارستانەکان لە ڕەزایە لە تاران، بۆ نەخۆشو کەساسەکان!

هۆ پیاوە مەردەکە، ئەی کوڕە جەربەزەکە، زیتەڵە، سینسافەکە! تۆ بۆ ئەوەندە خۆشەویست بووی! لە بیرتە پێم گوتی: توویی خودا هەڵە نەکەی، دونیا کارت تێ نەکا! ڕووت تێکردمو سوور هەڵگەڕایت، گوتت: مەگەر شتێك بووە؟! گوتم: نەخێر، بەڵام بەخودا زۆرم خۆش دەوێیت، زۆر دڵم پێوەی زۆر! تۆ زۆر باشت هێناوەو زۆر گەورەی لام، هێندەی حەزی یەعقووب بۆ یوسفەکەی، حەزم لێتە، هێندەی لێوی وشك بۆ ئاو، سوێم بۆتە، هێندەی بەهار بۆ نێرگز، عەودالتم، جەنابی پیاو، قوتت بدەم ئۆقرە نابم، توخودا نەڕووشێیت، نەکەی بدۆڕێیت! ئاخر بۆ نا؟! تۆ لە سینەتدا دڵی منداڵێکی بەریئت لێ ڕواوە، لە نێو تۆپە گوڵی کەللەی سەری موبارەکت، ئەشکی عەشق تك تك دڵۆپە دەکا، خەمی هەژار، گوڵەگەنم بۆ نەداران، بۆ برسییەکان قامەت دەکا! ئاخر بۆ نا؟! خۆ تۆ بوغزت لە ئەوین مارە دەکرد! بە باقەو باوەش، کەرامەتی دزراوی ئافرەتت تەسلیم دەکردەوە! ئاخر ئەو کاتەی گەچ بۆنی ئاردی دەداو تامی گۆشتیش لەبیر کرابوو، نەتهێشت حەمە مەلای بێکەس پەکی بکەوێتو لەناو جەرگەی ماڵەکەت کردتە باپیرەی بچکۆلەکانت، لە سەرمای بێنازیو دووریو فیراقی عەزیزانی قوتارت کرد، وام زانی خاڵۆتە! گوتت: فەرق ناکا، مرۆڤ مرۆڤە!!

هۆ پیاوە ئاڵتوونییەکە، هەی مەردوومە ناوازەکە، ئەی نموونەی نموونەکان، ئێمە هەمووومان قەرزداری تۆین، بە کۆچی تۆ هەموانت هەتیو، خامۆش خامۆش، وەك بەفرەکەی سەرگۆڕەکەت، ماڵە تازەکەت کشومات، دەست لەسەر سینگ، ڕوو لە ئاسمان واقوڕماوین، تێڕاماووین!

لە ئێستادا دەڤەرەکەی من بێ جەلیلەو چاو دەگێڕین کەسێ تامی کاك جەلیل بدا، زۆر سوێمانەو چاو دەگێڕین بۆ جەلیلێ، بەڵام ئەی دۆست، بە خودا نە فرمێسك دەرەقەتت دێو نە گریان پەکی پێ دەکەوێ! کۆپییەکەت جارێ ونەو چاوەڕێین خودای جەلیلو جەببار، خودای پڕمیهرو ڕەحمان، سێبووریو تەسەللامان بدات! ئێوەش ئەی ئاوایی واوان، نەلاس، ڕەبەت، ئەی هەموو گوندو لادێکانی باوەشی ڕەنگینی سەردەشتو پیرانشار، ئێوە سەربەرزن بە چەندین نموونەی جەلیلەکان، ئەرێ گەلۆ...

ڕۆشنفیکرانو ئوستادەکان، زاناو مێژەربەفرینەکان، هۆ لاوە خوێنگەرمەکان، ڕێگە نەدەن هەتیوبار بن، سرووشتی جوانی ئێوە، شەپۆلی پڕعیلمو مەعریفەی ئێوە، کارخانەی هەوڵو هیممەتی ئێوە، توخمی سەدان جەلیلی هەڵگرتووە، دەخیل نەکەن، ماتەم بن، وڵات ئەمانەتی ئێوەیەو زۆر نازدارەو نازی مەخەن، گەر ئێوە هەبن، ئاسمان هەم خۆری هەڵگرتووەو هەم ئاوی حەیاتی پێیە!

دواجار ئەی دۆستانی خودا، عاشقانی ڕێبازەکەی پەیامبەر، هاوڕێیانی جەلیلی موحەممەدیان؟! پێتان ڕادەگەیەنم لە ئێستادا ئەدرەسەکەی کاکە جەلیل گۆڕاوە، جاران کە لە سەنتەری ئاوایی لە خزمەتتاندابوو، ئێستا لە دەروازەی گوند، لەبن داربەڕووەکە، نزیك بە جادەکە، لەسەر لای ڕاست ڕاکشاوەو دەست لەسەر سینگ، دوور دەڕوانێو ئێستاش هەر خۆشەویستی پەخش دەکاو چاوەڕوانی نزای پاکو سەلامی دارە قەومی موئمینەکەی ئێوە دەکات!!



# هاوده‌می ڕۆح

گەرمیانی

تۆ تەنها مرۆڤێکی ئاسایی نیت، هێندە ڕۆحم پێت ئاشنایە، بە دووركەوتنەوەت دەگەمە ئانی سەكەرات!

دەڤەری دڵم، پێش نیگای دیدەم، هەموو ساتێ چاوەڕوانی هەڵاتنی خۆری ڕوخساری تۆیە، ئەی هاودەمی ڕۆحم!

کەناری چاوی هەردەم، شانشینی عاشقی ڕووتە.
بەڵێ وەك سورمە وایە، هەرچی سووتاوی تەجەللا بێ -وەفایی-

مرۆڤێك لە زمانی گوڵو هەستی پەپوولەو خەندەی بارانو نیگای مانگەشەو تێ بگات!

کەسێك بە بەستەی ئاوریشم ڕۆحت بلاوێنێتەوە،

کەسێك بە هێنانی ناوی لە زارتدا، هەست بە تامی شەهد بکەیتو لەسەر لێوت شەونمی گوڵاو بباری!

کەسێك تابلۆیەك بێت لە جوانییەکی سەرمەدی،

ئیدی ڕۆح، بێ ئەو هاودەمە، چۆن ناتوێتەوە؟

لەگەڵ مەحزی خەیاڵی، دڵ بە جارێ بۆتە كێوی توور
لە كن وەسفی جەمالی، لێوی واسیف گوڵ بە دامانە -مەحوی-

هاودەمێك دەستت بگرێت، وەك ئەو دایکەی کە دارەدارە بە منداڵەکەی دەکاتو دەیەوێت لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستێتو هێدی هێدی هەنگاو بنێت!

هاوڕازێك کەوا دەزانیت، لە ئامێزی ئەودا گەورە بوویتو لە خۆڵی ئەو درووست بووی......

مرۆڤێك کە دەڵێی تەنها هەر ئەو دەناسێتو بەتەنێ ئەویش تۆ دەناسێت!

لە دژوارترین ساتەکانتدا، لەگەڵت دەژیو لە بێدەنگترین ئێوارەدا ڕۆحت دەدوێنێ!

ئیدی ناتوانی خۆتی لێ قوتار بکەیتو لە ئەندێشەو خەیاڵی وەدەرنێی!

ئیدی ڕۆح بۆ هەمیشە ئاوێزانی دەبێت!

شەو دەکشێم شەونخونیو بێخەوی
ڕۆژ دەکێشم دەردو داخی بێئەوی -هێمن-

بە هاودەمیی ئەو، دەگەیتە نێوەڕاستی دڵنیاییو سەعادەتو هەمیشەبەهاری تەمەن!

لەژێر ساباتی میهری ئەودا، شنەی شەماڵی بەهەشت، گوڵاوپرژێنی ڕۆحت دەکاتو بە ئاوازی فریشتەئاسا، گفتوگۆ لەگەڵ ناختدا دەکات.

ئەوین وەك شیلەی هەنگوین، لە هەموو پیتەکانی زاری دەتکێ.....

لە حزووری ئەودا بۆنی فیردەوس دەگریت!

قەت بە بۆنی زوڵفی تۆ، نابێ گوڵاڵەو یاسەمەن
عەتری توڕڕەی تۆ، نەوەك عودە، نە میسلی عەنبەرە -ئەحمەد موختار-

لەوێدا هەست بە جیهانێکی جیاواز دەکەیت؛ چونکە تۆ لەسەر زەویدا، مرۆڤێکی بەهەشتی دەبینیت!

ئەو کاتەی دەگەیتە هاودەمی ڕۆحت، ئیدی گەورەترین تاوانە، فەرامۆشی بکەیت!

چرکەیەك لێی دوور بکەویتەوە، هەناسەیەك بێ ئەو هەڵبمژی، چرکەیەك بێفەرمانی بکەی، لە پێناوی گەیشتن بەودا سەرومال ببەخشە؛ چونکە هاودەمی ڕۆح، هاوسەفەرتە بۆ بەهەشتی نەبڕاوە.

دەستی گرتووی بۆ دەڤەری نوورو سەرچاوەی ئەوینو نیشتمانی مرۆڤ!

فەرموو، تەشریف بێنە کوڵبەی عاشقت ئەمشەو بەناز
حازرە بۆ بەردەبازی ڕێگەیی تۆ ئەم سەرە -ئەحمەد موختار-

ئازیزم، شـــەپۆلێك لە دونیاویســـتیو تەمی غەفڵەتو لەیادچوونی ئاخیرەت، دڵو دەروونی مرۆڤەكانی وەها داپۆشـــیوە، كە سۆمای چاوی لێـــڵ كردوونو خەندەی لێوی لێ دزیونو خـــەمو پەژارە، دەڤەری دڵی داگیر كردوون.

ئەم دونیا بچكۆلەیەو ئەم دوو ڕۆژە كورتەی تەمەن، چۆن گیرۆدەی كردوون، ئەگەر مرۆڤ ژیرو ئاوەزدار با؛ هێندەی پووشێك، خەمی لەم دنیا فانییە نەدەخوارد!

دراوودرەم، زیووزەڕ، چییان وەسەر ئەم خەڵكەدا هێناوە!!

خۆ ئێمە لێرە، بۆ بەهەشتی ئەبەدی ناگەڕێین!!

بەتەمانین تاسەر، لێرە دابنیشین..

ئەوە بێباوەڕانن كە دەیانەوێت، هەموو بەناوخۆشییەكان، لەم یەك دوو ڕۆژەی دونیادا تاقی بكەنەوە!

ئەبوحەییانـــی تەوحیدی دەڵێت: «اَلدُّنْيَـا جَنَّةُ الْكَافِرِ لأَنَّـهُ لَا يَلْحَظُ مَعَادًا، وَلَا يَشْتَاقُ ثَوابًا».

دونیا بەهەشتی بێباوەڕە؛ چونكە ئەو، نە چاوەڕێی زیندووبوونەوە دەكات، نە بەتاسەی پاداشتی خودایە.

ئێرەش بەشـــی ئەو هەموو خۆزگەو حەزو ئارەزووانە ناكات؛ بۆیە ئـــاوا بە هەر چوارلادا پەل دەكوتێو جگەلـــە تێركردنی ئارەزوو، هیچ شتێكی دی لەبەرچاو ناگرێ!

هاوكات وە نەبێ، باوەڕدار لە بەهەشتی دونیا بێبەش بێتو دونیا جگـــە لە زینـــدان بۆ ئەو، هیچـــی دی نەبێت! بەڵكو ناخـــی باوەڕدار، بەهەشـــتێكی هێندە ئاوەدانە، كە لە دەروازەی ئەو بەهەشتەوە، نیگای بڕیوەتە جەننەتولمەئوای ئەبەدی!

دونیـــا زیندانە بۆ باوەڕدار؛ چونكە ڕۆح دەیەوێت لە قەفەزی ئەم دونیایە، ڕزگاری بێتو بگاتە لیقای ئیلاهیو مەئوای هەمیشەیی!

عومەیرئاسا خواردنی چەند دەنكە خورمایەك، بە تەمەنێكی درێژ دەزانێ بۆ دواكەوتن لە بەهەشتێك كە فراوانترە لە ئاسمانەكانو زەوی!

ئـــەو دەزانـــێ، كە خۆخلافانـــدن بـــە كارو كایەی ئـــەم دونیا، لە خۆشترین دیدار دوای دەخات!

وەلێ مەخابن! ئێمە هێندە خەریكی ئەم خانۆچكە منداڵانەی دونیاو ماڵەباجێنەی ئێرەین! هەر نالێی بەتەمای بەهەشتین!

باشـــە بۆچی لە خۆمان ناپرســـین، ئەوەی ئێستا پێوەی خەریكین، دەمانگەیەنێت بە بەهەشت!

كاتێك ئێمە، ئاوا بەتوندی، باوەشمان كردۆتەوە بۆ دونیاو هەرگیز حـــەز ناكەیـــن، بەجێی بهێڵین، بەهەشـــت باوەشـــمان بـــۆ دەكاتەوەو فریشتەكان لە پێشوازیدا دەڵێن:

﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ الزمر: ٧٣

دوو خۆشەویست لە یەك دڵدا، جێیان نابێتەوە؟!

ناترســـی لەو كەســـانە نەبیت، كە پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێت: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ»؟! البخاري

چونكە دڵنیابە، خاوەنی دینارو درەم، كلۆڵو داماوو ســـەرگەردانو قوڕبەسەرە، با هەموو دونیاشی هەبێت!

چونكە ئەمە نـــزای پەیامبەرە، دەبێت هەر خەمو پەژارەو دەردی سەری بەشی بێت!!

ئـــەوان وا دەزانن، پارە بەختەوەری درووســـت دەكات؛ چونكە كەاتێك پارەمـــان هەبـــوو؛ دەتوانین ئەوە بكەین، ئەوە بكڕیـــن، ئەوە بخۆین، ئەوە لەبەر بكەین، ئەوە تاقی بكەینەوە، ئەوە بین كە دەمانەوێت!

بەڵام هەرگیز بەم شێوەیە، بەختەوەری بەدەست نایەت!

بەختەوەریـــی دونیا، ئەگەر بـــە بەختەوەریـــی ئاخیرەتەوە گرێ نەدرابێت، هیچ سوودێكی نییە! دەكرێت بۆ چەند ساتێك شادمان بیت، بەڵام بۆ هەمیشـــە، هەرگیز بە سەروەتو ســـامانی دونیا، بەختەوەری بەدەست ناهێنی!

هـــەر لەنێـــو ئەو دونیایـــەی كە زیندانـــی باوەڕدارە، بـــەراورد بە گەیشـــتن بە فیردەوس، بەهەشـــتێك هەس، كە نە ماڵو نە سامانو نە كورسیو دەســـەڵاتو پلەوپایەو نە كۆشكو تەلاری بەرزو بڵند، ناتوانن درووستی بكەن!!

ئەوە فیردەوسی ڕۆح و ئۆخژنی دڵو ئارامیی دەروونە!

لەوێدا بەختەوەری، ڕەشـــماڵی خۆی هەڵدەداتو باوەڕداری دڵارام، بە چاوی بەسیرەت، ڕووەو نەعیمی موقیم دەڕوانێ!

ئـــەوە ئەو بەهەشـــتەیە، كـــە هەر كـــەس تامی نەكردبـــێ؛ تامی فیردەوس ناكات!

چۆن بگەینە ئەو بەهەشـــتە شـــیرینە؟ چۆن خەمو خەیاڵی دونیا، دڵو دەروونمان داگیر نەكاتو كوڕی ئاخیرەت بین، نەك كوڕی دونیا؟!

وەڵامی ئەم پرســـیارانە، هەڵدەگرین بۆ نامەی داهاتوو.. كۆتاییش بەم وتەیەی خولەیدی عەسری دەهێنم، كە دەڵێت:

براكانـــم، كەس هەیە، بەتاســـەی دیـــداری خۆشەویســـتەكەی نەبێت؟!

كەواتە؛ دەی خوداتان خۆش بوێو هێدی هێدی بۆ دیداری ئەو هەنگاو بنێن!



# نامە نوورینەکان

## نامەی پەنجا

# لەگەڵ ئەورەحمان بەگی بابانی شاعیردا




شاعیر، ناوی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەحمەد بەگی کوڕی خالید بەگی کوڕی سلێمان پاشای کوڕی برایم پاشای بابانە.

ساڵی ١٨٨٠، لە سلێمانی لەدایك بووە، لە منداڵییەوە، چووەتە بەر خوێندنو لە مەدرەسەی ڕوشدیە، خوێندنی ئەو کاتەی خوێندووەو دواتر دەستی بە فەقێیەتی کردووە.

شاعیر، کەسێکی ئەدیبو خوێندەوارو شارەزاو کوردپەروەر بووەو لە شۆڕشی شێخ مەحموودا، نوێنەری شێخ بووە، بۆ باڵیۆزخانەکانی ئەورووپاو ئەمریکا.

خاوەنی شیعری جوانو نایابەو کۆمەڵێك شیعری نیشتمانیی بەرزیشی هەن، کە گوزارشت لە هەستی کوردایەتیی شاعیر دەکەن.

ساڵی ١٩٦٧، کۆچی دوایی دەکاتو لە گردی مامەیارە دەنێژری.

ئەمەش نموونەیەك لە شیعرەکانی:

هەر لە بحری فورسەوە خاکی، هەتا بەحری ڕەشە
نیشتمانی میللەتی کوردە، لە دونیا ئەم بەشە
ڕەوزەیەکی جەننەتە لالەو گوڵی دایم گەشە
پڕ لە ئاڵتوونی سیاهو زیوی صافو بێغەشە
نیعمەتو خێری، بەتاڵان وا بە دەست ئەغیارەوە
من بە دڵ هاوار ئەکەم، کەس نایە بەم هاوارەوە
شاخی کوردوستان هەموو ئێسقانی ئەجدادی منە
خاکو خۆڵی، گۆشتو لاشەی قەومی ئازادی منە
لاوی کورد، بۆ دایکی گەورەت شیوەنو ڕۆڕۆ مەکە
بۆ خۆرئاواو خۆرهەڵات، قەت مەیلی هاتوچۆ مەکە
ئیعتیمادت هەر بە خۆت بێ، قەت لە دوژمن کۆ مەکە
فەرقی خەصمی خاریجی، یا خائینی ناوخۆ مەکە

*     *     *     *     *     *     *

عارەقی سەرکوڵمە، یا ئاونگی سەر پەڕەی گوڵە؟
تکتکی ڕشتەی دوڕڕو یاقووتە، گەردانەی ملە
پەرچەمە کەوتۆتە سەر ڕوخساری ئاڵی پەنبەیی
یا لە باخی ئەرخەوانیدا، وەنەوشەی سەرچڵە؟
خەتتی تازەی دەوری لێوە، یا لە گوڵزاری ڕوا
حەلقە حەلقە دەوری غونچەی داوە، دەستەی سونبولە؟
ناڵەناڵم هاتە گوێ، پرسیم لە شانە، پێی وتم:
پەرچەمی ئەو شۆخە، نازانی، کە زیندانی دڵە؟

*     *     *     *     *     *     *

### من بە حەفتا ساڵەوە

من بە حەفتا ساڵەوە، کەوتوومە داوی ئاسکێ
چاو غەزاڵێ، وردەخاڵێ، بەژنو باڵاناسکێ
ئەو بە حەڤدە ساڵەوە، وەك دارگوڵی تازەو تەڕە
دڵفڕێنە، دڵستێنە، دڵشکێنە، دولبەرە
من وەکوو بەرگی خەزان، لەرزۆكو پەژموردەو هەژار
ئەو وەکوو تۆپی گوڵی تازەو تەڕی فەسڵی بەهار
زوڵفی چینچینی ڕەشی پەخشە لەسەر صەفحەی بلوور
موعجیزەی شۆخی نەبێ، چۆن جووت ئەبێ زوڵماتو نوور